# پەراوێزەکانی ئەوروپا...



سەعات چوارو نیوی بەیانی بوو، لە ناوجێ رەپێ بوومەوە، جەنتاکەم پێچایەوەو بەرەو وێستگەی شەمەندەفەری نۆرپۆرت(١) رۆیشتم. بلیتی چوون و گەڕانەوەم بڕی و یەکسەر بەرەو (سکاگن) بەڕێ کەوتم، کە نزیکەی (٢٨) سەعات بە شەمەندەفەر لە (کۆپنهاگن)ەوە دوور بوو.

شازدە سەعات زیاتر بوو (لەسەر نانخواردن، لەسەر توالێت، لە کاتی دەموچاو شتن، لە کاتی پیاسە.. بەردەوام) بیرم دەکردەوە: «بچم یا نەچم؟ بچم یا نەچم؟». لە کۆتاییدا بڕیارم دا بچم. خۆم وەک ئەو کوڕە کەچەڵە ئەفسانەییە دەهاتەبەرچاو کە دەچێ دەرمان بۆ چاکردنەوەی کوێرایی چاوی دایکی دەهێنێتەوە.

بۆ نا؟ ئامانجی ئەم چوونەم لەمەش گرنگتر و پێویستتر دەهاتە بەرچاو. لە دەرگادانی بەهەشتێک بوو، کۆتایی هێنان بوو بە مەرگەساتێک، رزگارکردنی چارەنووس و ژیانی مرۆڤێک بوو، تەنانەت دوو مرۆڤ(٢)

– سوپاس.

کوردۆ جگەرەکەی لێ وەرگرت.

---

**(١) وێستگەیەکی شەمەندەفەرە لە کۆپنهاگن. ئەو شەمەندەفەرانەی بەرەو دوورگەکانی باکووری دانمارک دەڕۆن، لەوێوە بەڕێ دەکەون.**

**(٢) پاڵەوانی ئەم چیرۆکەی من کە ناوی (کوردۆ)یە، هەژدە ساڵ پێشتر، ئەو کاتەی لە وڵاتی خۆی (لە خانەقین) بوو، جارێکیان رۆمانێکی رووسیی خوێندبۆوە کە باسی تلانەوەی گەنجێکی بەگزادەی دەکرد بەدەست دەردی گۆشەگیری و بێکەسییەوە. ئەو گەنجە تەنیایە نەیدەزانی چۆن چارەسەری تەنیایی خۆی بکات و لە دۆزەخی خەڵوەتنشینی و بێکەسیی خۆیدا دەرباز بێت. جارێکیان هاوڕێیەکی نزیکی خۆی پێی وتبوو: «هاوڕێم، تۆ،شتێک بدۆزەرەوە بۆ خۆت کە خولیای ببیت؛ یانیش کەسێک بدۆزەرەوە کە خۆشت بوێ!» ئیتر، کوردۆ، لەناو فارگۆنی شەمەندەفەرەکەدا، کە تەنیا یەک پیرەژنی دانمارکی لێ بوو و بەرامبەری دانیشتبوو، بیری لەم قسەیەی ناو رۆمانە رووسییەکە دەکردەوە. بیری دەکردەوەو لاپەڕەکانی دەفتەرێکی بچکۆلەی سووری هەڵدەدایەوە کە جار بەجار بیرەوەرییەکانی خۆی تێدا دەنووسییەوە.**

**پیرەژنە دانمارکییەکەش، دیار بوو، تەماشای دەفتەرە بچکۆلە سوورەکەی دەست کوردۆی دەکردو کونجکۆڵانە حەزی دەکرد کوردۆی غەریب و «پەناهەندە» بدوێنێ. لە کۆتاییدا، پیرەژنە دانمارکییەکە– بەپێچەوانەی عادەتی دانمارکییان– جگەرەیەکی پێشکەش بە کوردۆ کردو کوردۆی بە قسە هێنا.**

– جەنابت نیگارکێشیت؟
پیرەژنەکە ئەم پرسیارەی لە کوردۆ کرد.
– نەخێر.
– ئەدی کەواتە، زۆر جوانە... روخسەتم دەدەیتێ سەیری ئەم خەتانە بکەم؛ ئەم خەت و نیگارە قەشەنگانەی ناو ئەم دەفتەرە چین؟.
کوردۆ لە هەموو قسە دانمارکییەکان تێنەگەیشت:
– روخسەتم دەدەیتێ بە ئینگلیزی قسە بکەین؟.
– بەڵێ، بێگومان، ئۆو.. دانمارکی باش نازانیت؟ لە جەنابتم پرسی «ئەم نیگارە جوانانەی ناو ئەم دەفتەرە چین؟».
– ئەمانە نیگار نین، نووسین، نووسینی کوردین بە ئەلفبێی عەرەبی.
– ببوورە، لە شاگەشکەیی خۆمە کە بەم خەتە جوانانە پێدەکەنم، دڵم بە جوانیی ئەو کالیگراف و نیگارانە زۆر دەکرێتەوە کە تۆ دەڵێی نووسین. کەواتە نووسینی ئێوە زۆر سیحراوی و هونەرییە. ئەم جوانییە لە نووسینی ئێمەدا نییە، تۆ چەند ساڵە لێرە پەناهەندەی؟.
– ساڵێک و هەشت مانگە.
– لە کوێ دەژیت؟
– لە کۆپنهاگن. تۆ نیگارکێشیت، خانم؟.
– بۆ خۆم، بۆ خۆم رەسم دەکەم. هەر بۆیەش ئەم خەت و نووسینە سەرسوڕمێن و جوانانەی ناو دەفتەرەکەت سەرنجیان راکێشام. کەواتە تۆ کوردیت!.
– بەڵێ. خۆشحاڵم بە ناسینت، خانم، ناوم کوردۆیە.
– بێرگیت. من، هەواڵی ئێوەم تەنیا لەناو رۆژنامەکاندا خوێندۆتەوە.
– ببوورە، ناوی بەڕێزت؟.
– بێرگیت. (٣)
کوردۆ لێی پرسی:
– چ جۆرە رەسمێک دەکەیت، خانم؟.
– رەسمی تەنیایی! تەنیایی تاقە بابەتێکی رەسمکردنی منە. تۆ حەتمەن حەزت لە رەسمە؟.
– ژمارەیەکی زۆر لە برادەرەکانم نیگارکێش بوون و لەگەڵیاندا ژیاوم،



دڵم زۆر بە رەسم دەکرێتەوە. راستییەکەی، زیاتر لەناو کتێب و ئەلبوومانددا رەسم دەبینم.
– من نیوەی زیاتری تەمەنی خۆمم بە رەسمکردن بەسەر بردووە. ئەم پەنجە زەردەهەڵگەڕاوانەم دەبینی؟ هەموویان بە رەسمکردن ئاوها چرچ و لۆچ هەڵگەڕان؛ تەنانەت چاویشم، چاویشم هەر لە سۆنگەی رەسمکردن ئاوها کتوکوێر بوون.
پیرەژن، بەدەم پێکەنینەوە، بەخاکەڕایی و بێگوناهییەکی منداڵانەوە، چاویلکەکەی کردەوە چاوی:
– بەڵێ، جەنابی خۆشەویستم.
– لەوانەیە زۆر پێشانگەت کردبنەوە؟.
– هەرگیز. نەشمداونەتە هیچ گەلەرییەک. بۆ خۆم، تەنیا بۆ خۆم رەسم دەکەم. (٤)
کوردۆ لێی پرسی:
– کیرکگارد دەناسی؟.
– کێ؟
– کیرکگارد!
– ئۆو... «کیەرک گۆرد». دەیپەرستم. تۆ چۆن دەیناسی؟
– هەندێ نووسینم لەبارەی خوێندۆتەوە.
– بەڵێ ئەوەتا ئێستا زانیم بۆچی لەم دەمودەستەدا کیەرک گۆردت بیرهاتەوە. ژیان و هونەر و چارەنووسی من بە تەواوەتی لەوەی ئەو

---

**(٣) کوردۆ بە بیستنی ناوی «بێرگیت» کەمێک بێدەنگ بوو، پاشان لە دڵەوە، بێ ئەوەی ئاگای لە پیرەژن بێت وتی:**
**– ناوێکی خۆشە.**
**پیرەژن، دیاربوو، دڵی بەم هەستەی کوردۆ خۆش داهات، وتی:**
**– لوتفت هەیە**
**پیرەژن، کەمێک بێدەنگ بوو، لە نێوان شەرم و هەستی لە خۆگەڕاوەیی خۆیدا مات ما. سەیری پەنجەرەی دەکرد.**
**(٤) کوردۆ هەستی دەکرد جوانی و رۆشنبیری و مرۆڤایەتییەکی تراژیدییانە لەودیو سیما و قسەکانی ئەم پیرەژنە (٦٥) ساڵییەوە قوڵپ دەدات. بەتایبەتیش کاتێ پیرەژن باسی تەنیایی کردو وتی: «رەسمی تەنیایی دەکەم. تەنیایی تاقە بابەتێکی رەسمکردنی منە». کوردۆ یەکسەر «کیرکگاردی» بیرهاتەوە.**

دەچێ. من و «کیەرک گۆرد» بە تەواوەتی و تا مۆخی ئێسقانمان
دانمارکین، دانمارک ئەمەیە: تەنیایی، تەنیایی، تەنیایی. هۆیەکەشی
ئەمەیە کە وتم: «من تەنیا رەسمی تەنیایی دەکەم».

کوردۆ لەناو فارگۆنی شەمەندەفەرەکەدا، بەتەواوەتی خۆی و هەموو
شتێکی سەفەرەکەی و ئامانجی سەفەرەکەی بیرچوو بۆوە. کونجکۆڵانە
و بە پەرۆشەوە کەوتبووە ناو ئەم گێروگرفتە سەرنجڕاکێشانەی ژیانی
پیرەژنەکە؛ بەتایبەتیش لەبەر ئەوەی ئەمە یەکەم جاری بوو لە ژیانیدا
کە گفتوگۆیەکی لەم شێوەیە لەگەڵ مرۆڤێکی دانمارکی بکات، بۆیە
حەزی دەکرد درێژە بە گفتوگۆکان بدات:

– راستە، من تەنیا ساڵێک و هەشت مانگە لە دانمارکم، بەڵام وا
تێناگەم دانمارک ئەمڕۆ هەمان دانمارکی سەردەمی (کیەرک گۆرد) بێت.

– ئەوەی تۆ ئێستا دەیبینیت، شێوەی دەرەوەو روخسارەکەیەتی. تۆ
نەتتوانیوە بچیتە بنج و بناوان و ناواخنەکەی. هەموو مرۆڤێکی
دانمارکی، بەردەوام، لە هەموو چرکەیەکدا هەست بە تەنیایی دەکات و
دەترسێت:

لە هەڕەشەی جودابوونەوەو پارچە پارچە بوون و بە تەنیامانەوە
دەترسێت. ئەمەو جگە لەوانەی کە هەر خۆشیان تەنیان و بە تەنیا
دەژین، تۆ، لێرە، نیسبەتی خۆکوشتنەکانت لە دەست تەنیایی
نەخوێندۆتەوە؟.

رۆژنامەکان دەڵێن: «نیسبەتی خۆکوشتن لە دەست تەنیایی، لە
وڵاتی سوێد، لە چاو هەموو وڵاتێکی ئەوروپا زیاترە»، بەڵام من
واتێدەگەم ئەم نیسبەتە زۆرە، لێرە، لە وڵاتی ئێمەدایە! هەر چۆنێک
بێ، ئەمە حاڵی هەموو ئەوروپایە، نەک بەس تەنیا دانمارک و سوێد،
هێندە نەبێ کە تراژیدیای ئەم تەنیاییە لەناو دانمارکدا خەست بۆتەوە.
ئەمەش لەبەر ئەوەی ئێمە میللەتێکی بچووکین ئێمە بە هەموومان
تەنیا پێنج ملیۆن کەسین، دەزانی؟ ئەویش ملیۆنێکمان پەناهەندەین.

– من نەمدەزانی مرۆڤی دانمارکی هێندە هەست بە تەنیایی بکات.

– با ئێمەی دانمارکی، تەنانەت وەک وتم هەموو ئەوروپا، لە دەست
ئەم تەنیاییە رادەکەین و کۆمەڵ پێک دەهێنین، لە ترسی تەنیاییە باوەڕ
بە یەکتر دەکەین و ژن دەهێنین و مێرد دەکەین، یان جەربەزەکارانە
سەری خۆمان بۆ وڵاتانی ئەفریقا و ئاسیاو بەتایبەتی رۆژهەڵات



هەڵدەگرین. تەنانەت من وای دەبینم ئەوەی هەستی تەنیایی نەبێت،
دانمارکی نییە، ئەوروپیش نییە، تەنیایی، لێرە، رۆچۆتە ناو هەموو
ئینجێکی ژیانی مرۆڤ.

کوردۆ لەو دەمەدا شیعری (خوێنی پیس)ی رامبۆی بیرکەوتەوە، لە
دڵی خۆیدا وتی: «وایە» لە پیرەژنە نیگارکێشەکەی پرسی:

– بەڵام مەرجە ئەم واقیعە رۆبچێتە ناو دیدی هەموو
هونەرمەندێک؟.

– من بەلای خۆمەوە واتێدەگەم: هونەرمەندی دانمارکی ئەگەر باسی
تەنیایی و بێکەسی مرۆڤی دانمارکی نەکات، دانمارکی نییە، هیچیش
ئاگاداری ترپە بێکەسەکانی دڵی ئەوروپا نییە! ئەسڵەن هونەرمەند
خۆی پێویستە زەنگی خەتەرەکە لێبدات وئاگاداری تراژیدییەکەمان
بکاتەوە. (کیەرک گۆرد) سەد و پەنجا ساڵ پێش ئەمڕۆ پێشبینیی
ئەمڕۆی کرد بوو کە مرۆڤی دانمارک و ئەوروپا بەگشتی ئاوهای
بەسەردێت و لەناو دەردی تەنیاییدا دەتلێنەوە.

پیرەژنەکە وەک ئەوەی هەرچی داخ و حەسرەتێکی هەیبوو
هەڵیڕشتبێت، هەناسەیەکی حەسانەوەی هەڵکێشا. جگەرەیەکی
دیکەی داگیرساند، پاشان جەنتا گولینەکەی خۆی کردەوە، تاخمە
چکۆڵەکەی ماکیاژەکەی خۆی دەرهێناو بەرامبەر ئاوێنە بچکۆلەکەی
ناودەستی، کەوتە دەموچاوی خۆی.

کوردۆش، لەم نێوانەدا، بە هەڵی زانی لە چرچیی و لۆچیی
رووەمەتەکانی وردبێتەوە کە پاشماوەی جوانییەکی رەونەقداری کۆنیان
هێشتا هەر تێدا حەشاردرابوو، هەروەها بۆ یەکەمین جار هەستی پێکرد
کە ریزە دگانەکانی خوارەوەی پیرەژنەکە تاخمن. سەیر لەوەدا بوو: ئەو
هەموو تەمەنەی ئەم پیرەژنە تەڕپیرە، کە نزیکەی (شەست و پێنج)
ساڵێک دەبوو، هیچ کارێکی ئەوتۆی لە رۆحیات و جوانیی دەروونی
ئەم مرۆڤە نەکردبوو.

کوردۆ دەیویست پیرەژن هەست بەم رامان و تێبینییانەی ئەو نەکات،
لە هەمان کاتیشدا دەیویست لێی بپرسێت:

– خانم، ببورە؛ تەمەنت چەندە؟

بەڵام ئەم پرسیارەی بەلاوە جوان نەبوو، یان بەلای کەمەوە بە شتێکی
بێ ئەدەبانەی دەزانی. ئەگەر زیاتریش سەرنجی بدایەتە پەڵە

سوورەکانی خوار ئەوک و جووتە مەمکە گەورە شۆڕەکانی – کە بەتەواوەتی نیشانەکانی پیریتییەکی کەساسیان پێوە دیاربوو– لەوانەبوو پیرەژن ئەو کەفوکولە گەرم و کەلکەلە خرۆشێنەی بۆ قسەکردن هەی بوو، دامرکایەتەوەو چیدیکە ئارەزووی قسەکردنی نەمایە. بۆیە لێشی نەپرسی ئاخۆ بێوەژنە یان لەگەڵ مێردەکەی جودا بۆتەوە؟ منداڵی هەیە یان نەخێر؟ دەوڵەمەندە یان ئاساییە؟ لە دڵی خۆیدا وتی: «هەموو ئەمانە چ بایەخێکیان هەیە؛ مادام ئەم مرۆڤە هەست بە تەنیایی دەکات! پیرەژن هەست بە بێکەسی و رزانەوەی خۆی دەکات لەناو تەنیاییدا.. تەواو ئەمەیە مەسەلەکە».

– من بۆ خۆم تەنیام. زۆر بە قووڵیشەوە هەست بەم تەنیاییەی خۆم دەکەم.

پیرەژنەکە لەناکاو، لەبەرخۆیەوە، ئەمەی وت. پاشان، لە توێی پەنجەرەی فارگۆنەکەوە، تەماشای دیمەنە شاخاوییە راکردووە دوورەکانی دەکرد و وتی:

– ئێوەی رۆژهەڵاتی، جیاوازن. رۆژهەڵات شتێکی دیکەیە.

کوردۆ نەیدەویست هیچی ئەوتۆ لە بارەی خۆی بدرکێنێ، بەڵام تەنیا لە پێناو دڵدانەوەی ئەم پیرەژنە بێکەس و رۆح سووکە، وتی:

– من لەوەتەی لە دانمارکم، هەست دەکەم بە درێژایی بیست و حەوت ساڵی ژیانی رابردووی خۆم، هەر لە تەنیاییدا ژیاوم.

کوردۆ دەیویست لەمە راستگۆیانەتریش قسە بکات و بڵێت: «تا ئێستا نەمتوانیوە، بۆ نموونە، هیچ ئافرەتێکی دانمارکی بناسم و بۆنی بەرۆکی هیچ یەکێکیان بکەم»؛ بەڵام سەیری کرد «ئەم دان پیانانە» وەک پیاوێکی لاوازی پیشان دەدات.

– کەواتە، دەبینی؟ کەچی تۆ پێشتر دڵی منت دەدایەوە؟

– بەڵام خانم، من پەناهەندەم پەناهەندەیەکی وەک من: نەزمانی ئێوە دەزانم، نە کولتوورتان، نە دابونەریتتان.. نە وەزیفەیەکم لەناوتان هەیە، هەقی خۆمە تەنیا بژیم و تەنیا بمێنمەوەو هەست بە تەنیایی بکەم.

– من باس لە وڵاتی خۆتان دەکەم: ئێوە بۆ یەکتر و لەگەڵ یەکتر و لەناو وڵاتی خۆتاندا! نازانم؛ من لە کتێبی رۆژهەڵاتناس و فیلم و حەکایەتەکانەوە پێم گەیشتووە: ئێوەی رۆژهەڵاتی نازانن تەنیایی و



جودابوونەوە چییە، نموونەی خۆشەویستی و پێکەوە ژیان وکۆمەڵخوازی و خێزان وتەباییین.

– دەنا، دڵنیام لێت شاراوە نییە، ئێمەی رۆژهەڵاتی، هەموومان خۆزگە بە ئەوروپا دەخوازین.

– ئەمەیان هۆیەکەی ئەوەیە کە ئێوە ئێستا لە دەست جەنگێک رادەکەن کە بەسەرتاندا سەپاوە.

– نەخێر. هەر خۆزگە بە پێشکەوتنی ئەوروپا دەخوازین.

– دە، کەواتە، ئێوە پێویستە ئەوروپایەکی جیاواز بۆ خۆتان دروست بکەن!.

– بۆچی؟ بۆچی جیاواز؟.

– چونکە ئەوروپای ئەمڕۆی ئێمە تەنیاییە، ئەم تەنیاییە کوشندەیەی کە دەیبینیت! ئێمە خۆمان ئەوروپای خۆمان دروست کرد، ئێوەش ئازا بن: خۆتان ئەوروپای خۆتان دروست بکەن!(٥)

---

**(٥) کوردۆ لەناو خۆیدا کەمێک داشکایەوە، هەستی کرد نوقتەیەکی لاوازیی ئەمی درکاند. ئایا مەبەستی چییە کە دەڵێ «ئێمە خۆمان ئەوروپای خۆمان دروست کرد،. ئێوەش ئازا بن: خۆتان ئەوروپای خۆتان دروست بکەن»؟! مەبەستی ئەوەیە کە ئێمەی کورد لە وڵاتی خۆماندا، تەمبەڵ و کەودەن، هەر خەریکی شەڕ، ژن و ئافرەتەکانی خۆمان بەستۆتەوەو دێین لێرە (لە ئەوروپا) بە دوای سێکس و ژن و عەقڵ و ئاسوودەییدا دەگەڕێین؟ یان مەبەستی ئەوەیە کە بە کوردۆ بڵێ «فەرموو، ئەوەتا ئەنجامی ئەوەی کە تۆ وڵاتی خۆتت جێهێشتووەو ئەوروپات بە بەهەشتی سەرزەمین زانیوە»، هەبێ و نەبێ ئەم پیرەژنە نیگارکێشە ژمارەیەکی زۆر لە پەناهەندەی رۆژهەڵاتیی وەک ئەمی لە دانمارک ناسیوە و هەموو نهێنییەکی ژیانی پەناهەندەیەکی تەنیای وەک ئەم ئاگادارە! خەڵکی ئەم وڵاتەیە و قابیلە هێندە یاغنیش بێت کە نەزانێت دۆخی ژیانی «پیاوێکی پەناهەندەی کورد لە دانمارک» چۆنە و چۆن نییە؟ لەوانەیە ئێستا بەزەییەکی زۆریشی بە حاڵی کوردۆدا بێتەوەو بزانێت، وەک هەموو پەناهەندەکانی تر (لبنانی، فەلەستینی، سریلانکی، هیندی...) کە حاڵی پیاوێکی بیست و حەوت ساڵەی پەناهەندەی بێ ژن، چەنێک کوشندەو نالەبارە!**

**دەردو نسکۆ و حەژمەتی هەموو ئەو نیوەشەوە درەنگانە چەنێک پڕ سفتوسۆیە کە بەتەنیایی، سەرخۆش، لە دیسکۆیەک یان لە بارێکی پڕ ئافرەتەوە «بەدەستی بەتاڵ» دەگەڕێیتەوەو هیچ کچێک، ژنێک، تەنانەت بێوەژنێکیش نابێت لە کاتی کوژاندنەوەی گڵۆپێکدا پێت بڵێ «شەو شاد!».**

کوردۆ، چاوشکاو، بەم قسەیەی پیرەژنەکە زۆر بەسەر خۆیدا شکایەوە. نەشی دەویست لە پێش ئەم پیرەژنە زیرەک و راستگۆیەدا، خۆی بە شکاوی و دۆڕاوی پیشان بدات هەولّی دا بەڕادەی ئەو، راستگۆیانە قسە بکات:

– من لێرە بێ ژن و مالّم، بەلاّم هەرگیز بەو رادەیە هەست بە کوشندەیی ئەم تەنیاییە ناکەم.

– من مەبەستم لە قسەکەی پێشووم ئەوە بوو: تۆ بە هەمان حالّی ئێستەت، ئەگەر لە ولاّتی خۆتدا بوویتایە، هەستت نەدەکرد بەختەوەرتریت؟.

– با. بەلاّم من نەمتوانی لە ولاّتی خۆمدا بمێنمەوە.

– هەلّبەتا دەزانم، لای ئێوە جەنگە، بەلاّم پرسیاری من لەسەر سیستەمە خێزانداری و کۆمەلاّیەتی و رۆحییەکەیە.

– بێگومان لەگەلّتام.

– من غەریبیی مێردە کۆنەکەم و مندالّەکانم دەکەم، غەریبیی مندالّیی خۆم و هەرزەکاریم و گەنجێتیی خۆم دەکەم. ئەوروپا غەریبیی سەدەکانی شازدە و حەڤدە و هەژدە و نۆزدەی خۆی دەکات...

– منیش غەریبیی شارەکەی خۆم.

– کەواتە، ئێمە هەموومان غەریبین، هەمووومان تەنیایین. هەر یەکەو غەریبیی شتێک و کەسێک دەکەین، هەر یەکەو شتێک و کەسێکمان لێ نوقسانە.. حەوجەی یەکترین.. پێویستیمان بەیەکتر هەیە.. گوناحین. (٦)

لێرە بەدوواوە، هەردووکیان، ماوەیەک بێدەنگ، مات؛ هۆن هۆن– بەبێ فرمێسک– بەسەر مەیتی تەنیایی و بێکەسی خۆیاندا دەگریان.

کوردۆ لەناکاو، کاتێ چاوی کەوتە سەر روخساری ماندووی پیرەژنەکە، دیتی: پیرەژەن پیلّووە ماندووەکانی خۆی، لەودیو چاویلکە چوارگۆشەکانییەوە، وردە وردە لێک دەنێت و خەو دەیباتەوە. لەوە دەچوو ماوەیەکی یەکجار زۆر بووبێ هێندەی ئەمڕۆ قسەی نەکردبێت.

---

**(٦) کوردۆ لە دلّی خۆیدا وتی: «نەمدەزانی ئەوروپا هێندە زەبوون و تەنیا و بێکەسم دەکات»، «نەشمدەزانی ئەوروپا بۆ خۆیشی هێندە غەمگین و تەنیا و کەساسە».**



خۆ بە هەمان شێوە(کوردۆ)ش، نە لەگەلّ برادەرە کوردەکانی لە کۆپنهاگن نە لەگەلّ ئەو پەناهەندە فارس و لبنانی و سریلانکی و فەلەستینییانەی کە لە ئاپارتمانەکەی ئەودان هەرگیز هێندەی ئەمڕۆ قسەی نەکردووە! ئەمیش ماندووە! زۆریش ماندوو.

کوردۆ سەری بەپشتدا نەواند و پشتی ملی نا بە نەرمایی کورسییەکەوەو کەوتە ناو خەیالّی عەشقەکەی خۆیەوە: یەکسەر ئەو بەیانییەی بیرهاتەوە کاتێ پۆستەچییەکە لەودیو دەرگاکەوە، تەپ، تەپ،تەپ، کۆمەلّێک رۆژنامەی ئیعلانات و پڕۆپاگاندەی فڕێدایە نێو ژوورەکەیەوە؛ ئەمیش بۆ بێ تاقەتی و رەواندنەوەی هەستی تەنیایی خۆی، چوو یەکێک لە رۆژنامەکانی، لاپەڕە بە لاپەڕە هەلّدایەوەو دیتی لە یەکێک لە گۆشەکانی (یەکتری ناسین)دا کچێکی جوانی جحێلّی قژزەردی چاوشین لە ژێر رەسمەکەی خۆیدا نووسیویەتی کە خەلّکی شاری (سکاگن)ە لە جەزیرەی ژیلاندی باکووری دانمارک (لە گەڕەکی تۆستغۆب، شەقامی برۆندبی، خانووی ژمارە (٧))؛ حەزدەکات پیاوێکی رۆژهەلاّتیی خوێن گەرمی قۆز بناسێت، بەلاّم بە دوو مەرج؛ یەکەم: پەناهەندە بێت و ئیقامەی پۆلیسی هەبێت و زمانی دانمارکی یان ئینگلیزی باش بزانێت؛ دووەم: حەز لە ئەدەبیات و رەسم و خوێندنەوە بکات و پیاوێکی رۆمانسی و عاتیفی بێت!

ئێ ئەمیش، کوردۆ، «کوردۆی سمێلّ کەشی خوێن گەرمی قۆز»، کە کاتی خۆی سالاّنێکی زۆر، لە خانەقین، قۆزی و کەشخەیی ئەو، بنێشتەخۆشەی دەمی کچە جوانەکانی «ئەعدادیەی ثەورە» و پاشانیش کۆلێژی ئادابی مووسلّ بوون لە بەشی ئینگلیزی؛ ئەوەتا ئێستا، وا نزیکەی بۆ دوو سالّ دەچێ تامی ژن و بۆنی بەرۆکی هیچ کچێکی نەکردووە. راستە؛ لێرە، لە ئەوروپا، کچ پەیدا کردن بە قۆزی و کەشخەیی نییە! رزایەوە هێندەی لەناو تەنیایی و بێ کچی و بێکەسیدا پیاوەتیی خۆی بترنجێنێتە نێو کونی دۆشەگە قەدکراوەکانەوە! هاوڕێکانی خۆی «سامان، عەبدوللاّ، مەغدید، ژیلوان..» لەگەلّ پڕ و پیرەژنی پەنجا سالّی و شەست سالّی دەژین، کەچی ئەم ئەوەشی پێ ناکرێت!

راستییەکەی، خۆ ئەم ئەوەی دوو جاران بۆ هەلّکەوت: جارێکیان لە (ئایرش بارِ) و جارەکەی تریان لە (تیڤۆلی)؛ بەلاّم نەیویستووەو

حەزناکات- پێی شەرمە- خەڵک پەنجەی بۆ رابکێشن! باش نییە وەک (شێروان) و (رەحیم) نەچووە لەگەڵ نێرەمووک و ئەو پیاوانەی دەیانەوێ خۆیان بکەنە ژن، بەزمی خۆی ببەستێت و لەگەڵیان بژیت؟. کەواتە، بۆ نا؟ جێگەی خۆیەتی ئەم رێگەیە تاقی بکاتەوەو لەم دەروازەیە بدات! سەفەرێکە و وا بەرێوەیە، هەڵتەک هەڵتەک، لەناو فارگۆنی شەمەندەفەردا، خەون دەبینێ، ئاواتەخوازە، بۆ نا؟ بۆ نەچێ؟.

کچێکی جوانی دانمارکیی رێکوپێک، مادام داوای ئەوەی کردووە کە پیاوەکە پێویستە «رۆمانسی و عاتیفی» بێت و حەز لە ئەدەبیات و رەسم و خوێندنەوە بکات، مانای وایە کچەکە بۆ خۆیشی دیارە رۆمانسی و عاتیفییە و حەز لە ئەدەبیات و رەسم و خوێندنەوە دەکات. لەوە دەچێ لە ئەوروپا، ئەو کچانەی لە دەرەوەی پایتەخت و لە شارە دوورەکاندا دەژین یان لە گوندەکاندا، هەمان سروشت و ئاکاری کچانی ناو پایتەخت و شارە گەورەکانیان نەبێت؛ وەک ئەوان بڵندفڕ و لووت بەرز نەبن؛ سادەیی و کچایەتییەکی دەشتەکییانەیان جارێ هێشتا لەناودا مابێتەوە!

بەڵێ، بەدەستی شارستانییەتی قەرەباڵغی ئەوروپیی خۆپەرست، بەتەواوەتی پیس نەبوون. وایە کچانی گوند و دەرەوەی شار، حەتمەن، خوێنێکی پاکی کچانەی خۆمانیان تێدا دەژی، بەڵام بۆ نەچوو، پێش ئەوەی سواری شەمەندەفەر بێت، لە ماڵەوە، پاک پاک، ئەو سمێڵە کەشە زلەی بتراشێت؟. کچی دانمارکی، بە شێوەیەکی گشتی، حەز لە سمێڵ ناکەن. دەی، دەمێکی تر، هەر لەناو توالێتی شەمەندەفەرەکە دەیتاشێت.

بەڵام نەخێر، نەء، ئەم خۆی چۆنە و چۆن بووە، با هەر وەک خۆی بمێنێتەوە. کێ ناڵێ لەو کچانەیە کە حەزیان لە سمێڵە؟ با جارێ بزانێ چۆن دەبێت!(٧)

– ئەو دەمەی شەمەندەفەر جەزیرەی شیلاندی کۆپنهاگن جێ دەهێڵێت بەرەو دوورگەی (ئۆذنسە)، دەچێتە ناو پاپۆڕێکی

(٧) کوردۆ، بەدەم ئەم خەیاڵاتە خۆشانەیەوە تاسەی گەیشتنە (سکاگن)، بەرامبەر پیرەژنەکە، وردە وردە پێڵووەکانی کەوتنە سەر یەکترو لە ئاکامدا کەوتە خەوێکی قووڵەوە.



زەبەللاحەوە، ئیدی پاپۆڕەکەش، لەسەر پشتی دەریا، شەمەندەفەرەکە دەگەیەنێتە شاری (ئۆذنسە). من لەو کاتەدا دڵم نەهات لە خەوت هەڵبستێنم، نووستنێکی قووڵ نووستبوویت، بە تەنیا دابەزیم و چوومە دەرەوە چوومە سەر پشتی پاپۆڕەکە و قاوڵتییەکم کرد.

کوردۆ وتی:

– من ئەمەم نەدەزانی. جارێکیان خەبەرم بووەوە، شەمەندەفەرەکە راوەستابوو، دیار بوو دیسان چووبۆوە نا و پاپۆڕەکە. دنیا تاریک بوو، تۆش خەوت لێ کەوتبوو. نەفەرێک (پیاوێکی پیر بوو) لە تەنیشت تۆ دانیشتبوو. هەڵسام چووم تەوالێتێکم کرد و نانێکم خواردو هاتمەوە.

– بەڵێ. ئەمە دیسان، شەمەندەفەرەکە، بۆ جاری دووەم، چۆتەوە ناو پاپۆڕ. پەڕینەوەی نێوان دوورگەی (ئۆذنسە) و (ژیلاند) بووە.

– من ئەمە یەکەم جارە ئەم رێگەیە دەگرمە بەر.

– ئەرێ بەڕاست، تۆ، بۆ کوێ دەچیت؟

– بۆ شاری سکاگن.

– بەڕاستتە؟.

– بەڵێ.

– من خەڵکی ئەوێم.

– بە ئیش هاتبوویتە کۆپنهاگن

– نەخێر. من بیست و دوو ساڵ زیاترە نەهاتبوومە کۆپنهاگن. هەر لەو وەختەوەی لەگەڵ مێردەکەم لە یەکتری جودا بووینەوە، ئیدی (سکاگن)م جێ نەهێشتووە. دووای رابووردنی ئەم بیست و دوو ساڵەش ئەمە یەکەم جارە دێمە کۆپنهاگن. چووم سەرێکم لە کوڕەکەم دا، سێ ساڵ و شتێک بوو نەمبینیبوو.

کوردۆ، لە کاتێکدا سەیری پیرەژنەکەی دەکرد وگوێی لێ راگرتبوو، لەناکاو – خۆیشی نەیدەزانی بۆچی؟ – هەستی بە رەزاگرانیی ئەو پیرەژنە تەرپیرە کرد؛ هەستی کرد لەسەر دڵی زۆر گرانە کە ئەم رێگە دوور و درێژەی لەگەڵ ئەم پیرەژنە زۆربڵێ و دەڵەقۆڕە تەی کردووە.

لێی پرسی:

– چەندمان ماوە بگەینە سکاگن؟.

– دەمێکە شاری ئۆلبۆرگمان رەت کردووە.

تەماشای سەعاتەکەی کرد:

– پێم وایە چارەگە سەعاتێکی دیکە دەگەین.
پیرەژن ئەمەی وت و هەڵسایە سەر پێ، لەناو دەرگای فارگۆنەکەدا وتی:
– دەچمە تەوالێت.(٨)شەمەندەفەر وەستا، پیرەژن، جەنتایەکی گەورە لە دەستی و جەنتایەکیش بە شانەوە؛ کوردۆش تەنیا یەک جەنتای سەفەری بە شانییەوە، لەناو ئاپوورەی شەمەندەفەرەکەوە کەوتنە سەر شۆستەی وێستگەی سکاگن! کاتژمێر دەوروبەری هەشتی بەیانی بوو.
کاتێ کەوتنە ناو یەکەم شەقامی شارەکە، کوردۆ چاوی بە شاخ و داخە رەنگینە دوورەکانی دەوروبەری خۆیدا دەگێڕا، وتی:
– سکاگن شارێکی جوانە.
– بەڵام بچکۆلە دیارە. وا نییە؟
– لە چاو کۆپنهاگن. بەڵێ.
– سکاگن دوواپین شاری باکووری دانمارکە. ئێمە ئێستا دراوسێی سنووری نەرویجین. ئەم دیو ئەو شاخە، ئیتر نەرویجە! تۆ، پێم بڵێ بۆچی هاتوویتەتە ئەم بنی دنیایە؟
کوردۆ تا ئێستا باسی ئەوەی بۆ پیرەژنەکە نەکردبوو کە رۆژێک لەسەر لاپەڕەی رۆژنامەیەکی ئیعلاناتدا، لە گۆشەی (یەکتر ناسین)دا چاوی بە کچێکی جوانی جحێڵی قژزەردی چاوشین کەوتووە کە لە ژێر رەسمەکەی خۆیدا نووسیویەتی کە خەڵکی شاری سکاگنە و لە گەڕەکی (تۆستغۆب) لە شەقامی (برۆندبی) لە خانووی ژمارە (٧)دا دەژیت و حەزدەکات پیاوێکی رۆژهەڵاتیی خوێن گەرمی قۆز بناسێت و...
ئێستا ئەوەتا، ئیتر ئەمیش، بۆ لای ئەو کچە جوانە جحێڵە دەچێت.

**(٨) پیرەژن، کاتێ گەڕایەوە، بە پەلەپرووزێ، دەستی بۆ جەنتاکانی سەرەوە درێژکردو بە کوردۆی وت:**
**– هەڵسە! گەیشتین**
**– سکاگن!؟**
**– بەڵێ، ئا. دەی. خۆت کۆبکەوە! پێم بڵێ، حەزدەکەی رێبەرایەتیت بکەم لە شارەکەی خۆم؟.**
**– بەڵێ، ئەگەر سەغڵەت نابیت و لە وەختت ناگرم.**
**– بە خۆشحاڵییەوە، تۆ لێرە غەریبیت.**



نەء، پێی نەوتبوو، پێی شەرم بوو، یان بەلای کەمییەوە هەستی دەکرد ئەمە (ئەگەر پیرەژنەکە پێ بزانێت) لە شەخسیەتی کوردۆ کەم دەکاتەوە. هەر چۆنێک بێ، بە پێویستی نەزانی ئەم نهێنییەی خۆی بدرکێنێ، وتی:
– سەر لە هاوڕێیەکی خۆم دەدەم.
– لە کام گەڕەکی ئێرەیە؟.
– گەڕەکی «تۆستغۆب».
– بەڕاستتە؟
– بەڵێ.
– هەمان گەڕەکەکەی منە. ئەوەتا وا پاسەکە هات.
پاسەکە، پشتی لەناو شار، نزیکەی چارەگە سەعاتێک لە سەنتەری شار دوورکەوتەوە. بەناو هەزاران دارو درەخت و گردۆڵکەی سەوزی سەرکەش و سەربەهەڵمدا، تاکوتەرا خانووم دەدیت، کە ئەویش تا بینەقاقای نوقمی تەم وگەردی جوانی بەیانی بوو. من لەبەر رووانینە ئەم هەموو جوانییە سروشتییە، حەزم نەدەکرد هیچ قسە و پرسیارێکی ئاراستە بکەم.
پیرەژن، لەناکاو لێمی پرسی:
– ناوی شەقامەکە (برۆندبی)یە؟
– بەڵێ.
زۆر سەیرم پێ هات کە لە خۆیەوە ناوی شەقامەکەی زانی. وتم:
– چۆنت زانی؟
– چونکە تەنیا دوو شەقام لەم گەڕەکەی ئێمەدا هەیە.
پاشان ئێستێکی کردو وتی:
– ژمارەی خانووی هاوڕێکەت چەندە؟
وتم: (حەوت).
وتی: باش. تەواو.
کە لە پاسەکە دابەزین، پیرەژن دەستی درێژکرد بۆ دوور، پەنجەی بۆ ناو کۆمەڵێک خانووی لاچەپ و دوورەدەست درێژ کرد، کە بە دامێن قەدپاڵێکی سەوزەوە بوون و دەتوت مرۆڤ هەرگیز و هەرگیز پێی بەسەر ئەم رێگەیەدا نەناوە؛ وتی:
– ئەمەیە گەڕەکی (تۆستغۆب).

پیرەژن، پێش من کەوت. ملی پێوەنا، زۆرکەیفخۆش، بەغار، بەناو گیا و گۆڵە نەرم و فێنک و نیمچە تەڕەکەدا. منیش بەدوایەوە، سست، رامابووم، مات، غەریبانە، وەک بڵێی بە پێویستی بزانم کەسێک بێتە پێشوازیمەوە؛ چاوم بەناو خانووەکاندا دەگێڕا. لە دوورەوە، پانۆی هەڵواسراوی سەر نێوچەوانی شەقامەکەم خوێندەوە: تۆستغۆب، شەقامی برۆندبی.

بە دوای شوێن پێی پیرەژنەکەوە، کەیفخۆش، لەگەڵ یەکەمین هەنگاومدا بۆ سەر شەقامی (برۆندبی) زەردەخەنەیەک کەوتە سەر لێوم؛ سەرتاپای رۆح و دڵ و جەستەمی ئاودایەوە. شاگەشکە، گیانێکی دیکەم بەبەردا هاتەوە.

لەسەر شەقامی (برۆندبی)، لەناکاو دیتم:

پیرەژن، لەبەردەم دەرگای ماڵێک وەستا، کلیلی خستە ناو کونی دەرگاکەوە. کاتێ من گەیشتمە لای، ئەو خەریکی کردنەوەی دەرگاکە بوو. بە زەردەخەنەیەکی گەش و ئاسوودەوە لێمی پرسی:

– هاوڕێکەت ناوی بێرگیت–ە؟

زۆر سەیرم پێ هات:

– چۆنت زانی؟

بە دەستی چەپ لایەکی دەرگاکەی خستە سەر گازارەی پشت، گوتی:

– بەخێر بێی بۆ گەڕەکی (تۆستغۆب)، شەقامی (برۆندبی)، خانووی ژمارە (٧). ئێرەیە! تۆ میوانی منیت.

وەک ئەوەی سیحرێکم لێ کرابێت، بەسەرسوڕمان و پەشۆکاوییەوە چاوم بە نیوچەوانی دەرگاکەدا دەگێڕا.

تەواو بوو: ژمارە (٧)، شەقامی برۆندبی!

تازە، خۆ لەگەڵ پیرەژنەکەدا ببووینە هاوڕێ، فەرمووشی لێ کردبووم، دەرگاکەش ئاوەڵا بوو.

بە خۆم وجەنتاکەمەوە چوومە ژوورەوە: حەپەساو!

پیرەژن بەخێرهاتنی لێکردم و وتی:

– فەرموو دانیشە.

لە ناو چیمەنەکەی دەستە چەپدا، لەسەر کورسییەک دانیشتم. پیرەژن دیار نەما. بە خۆمم وت «تەواوە»، «ناوی بێرگیتە» لە ناکاو، هاتەوەو پەرداخێک ئاوی دایە دەستم. پێش ئەوەی ئاوەکە بخۆمەوە. لێم



پرسی:

– بەڕاستی، تۆ بێرگیت پۆڵسۆنی؟!

پیرەژن ناسنامەکەی خۆی دەرهێنا و دایە دەستم. تەماشام کرد: (بێرگیت پۆڵسۆن. مامۆستای خانەنشین. لە دایکبووی ساڵی (١٩٣٨) سکاگن. گەڕەکی تۆستغۆب، شەقامی برۆندبی، خانووی ژمارە (٧)). هەمان ئەو ناو و ناونیشانەی کە لە گۆشەی یەکتری ناسینی رۆژنامەکەدا خوێندبوومەوە، هەمان ئەو ناو و ناونیشانەی کەمنی لە کۆپنهاگنەوە هێناوەتە ئێرە! پێم وت:

– بەڵام تۆ وێنەی کچۆڵەیەکی جحێڵت لەلای ئیعلانەکە هەڵواسیبوو!

– ئەو وێنەیە، وێنەی زەمانی گەنجێتیم بوو،خۆم بە ئانقەست ئەمەم کردبوو.

– بۆچی؟.

– ئەگەر وام نەکردایە، تۆ دەهاتیتە لام؟.

ئاوەکەم خواردەوەو پەرداخەکەم دایەوە دەستی.

پیرەژن، دڵخۆش، چوو سینی و پەرداخەکە بباتەوە؛ وتی:

– ئێستە دێمەوە.

لە دواوە، تەماشایەکی کفڵ و سمتی خڕ و شۆڕیم کرد. هەوەسی ئەوەم هەستا کە یەکسەر بچم لە ژوورەوە ئەو کفڵ و سمتە خڕە سپی و سۆڵەی بنێمە ژێر خۆمەوە.

لە دڵی خۆمدا وتم: «قەیدی چییە؟ زۆربەی برادەرەکانم، مەغدید و ژیلوان و عەبدوڵڵاو سامان.. هەموویان لەگەڵ پڕ و پیرەژنی پەنجا ساڵی و شەست ساڵی دەژین، منیش با وا بکەم»، «ئاخ»؛ «لەوە دەچێ ئێمەی جیلی گەنجی ئاوارەی ئەوروپا، هەموومان هەر پەراوێزبین: پەراوێزەکانی ئەوروپا».

پاشان، بە خەفەتێکەوە بە خۆمم وت:

– نزیکەی دوو ساڵە، لە کۆپنهاگن، لەناو تەنیایی و بێکەسیدا پیشام؛ بۆگەنم کرد. بێرگیت ژنێکی میهرەبان و رۆشنبیرە، «هیچ نەبێ بۆ فێربوونی زمان».. تەواو.. لەگەڵیدا دەژیم...(٩)

**(٩) کوردۆ لە کۆپنهاگن بلیتی گەڕانەوەشی بڕیبوو. لەسەرەخۆ، بلیتی گەڕانەوەکەی لە باخەڵی خۆی دەرهێناو دڕاندی.**

کە پیرەژن هاتەوە ناو چیمەنەکە، کوردۆ لەسەر کورسییەکە دانیشتبوو، سەری شۆڕ کردبۆوە سەر مێزەکەی بەردەمی و تەماشای بلیتە دڕاوەکەی سەر مێزەکەی دەکرد.

**پاریس – هەولێر**
**١٩٩٣ – ١٩٩٩**



# راکردوو

که له چایخانەکە دانیشتم و پشتم دایە کورسیەکە، دەمویست کەمێک بحەسێمەوە؛ یەکسەر هەستم کرد قاچی راستی خۆمم له ئۆردووگاکەماندا لەبیرکردووە.

من بەدرێژایی ژیانم هەرگیز قاچی خۆمم له هیچ شوێنێک لەبیر نەکردبوو، ئەمە یەکەم جار بوو شتی ئاوهام بەسەر بێ. کاتێ هەڵسامەوە برۆم، چایچیەکە، کە پیاوێکی رەشتاڵەی عەرەبی ئەو باشوورە بوو، لە بەردەرگای چایخانەکەدا بەسەرسوڕماویەوە لێی پرسیم، وتی:

" ها؛ رۆیشتی ! ".

وتم: " نابینی؟ ".

وتی: " چی؟".

وتم: " قاچی راستی خۆمم له ئۆردووگاکەماندا لەبیرکردووە".

پێکەنی، وتی: " تۆ چەند ساڵە سەربازی؟".

وتم: " تەنیا دوو مانگە".

وتی: " هەقی خۆتە؛ رانەهاتووی " .

بە تاقە قاچێکەوە، بە شەلەشەل رۆیشتم؛ گەیشتمەوە ئۆردووگاکەمان. دووای ماوەیەک چاوەڕوانی لە بەردەم ژووری ئەفسەرەکەماندا، رێگەیان پێدام بچمە ژوورەوە. بە هەناسەبڕکێوە، سلاوێکی سەربازیم بۆ ئەفسەرەکەمان کرد، وتم:

" ببوورە گەورەم، قاچی راستی خۆمم لە مەیدانی مەشقکردندا لێ لەبیرچووە ".

ئەفسەرەکە تووڕە بوو، بە سەرما شیڕاندی:

" بۆ شتی ئاوها مەیەرە لای من، بچۆرە لای عەریفەکەتان".

چوومە لای عەریفەکەمان، هەمان شتم کرد، هەمان شتم وت. ئەویش بە هەمان شێوە، وتی:

" بچۆ لای نایب عەریفەکەتان".

نایب عەریفەکەمان ناوی مەجنوون موجریم حەرامی بوو، بانگیان دەکرد نایب عەریف مەجنوون. پیاوێکی هەتابلێێ بەنەزاکەت بوو. لەگەڵم هات و بردمیە ناو جبەخانەیەکی گەورە، تاریک: پڕ بوو لە



دەست و قاچ و سەر و لووت و گوێ و ڕان و پشت و پەنجەی مرۆڤ.

وتی:

" بگەڕێ!".

خوار و ژووری ناو جبەخانەکە گەڕام، قاچە بزربووەکەی خۆمم نەدۆزییەوە. خەریک بوو لە خەفەتان دڵم شەقی دەبرد. وتم: "چی بکەم؟".

وتی:" کەواتە لە مەیدانی مەشقکردندا لێت بزر نەبووە".

وتم:" با. ئەم ئێوارەیە، پێش ئەوەی دەست بە مەشقکردن بکەین، هەمبوو".

بەتوندییەوە دووپاتی کردەوە:

" نەء ، لە ئۆردووگا لێت بزر نەبووە".

ـ با.

ـ درۆدەکەی. لە شوێنێکی دیکە لێت بزربووە.

دەرگای جبەخانەکەی کلیلدا، وتی:

" ئەم شەو جاری بگەڕێوە ماڵ، سبەینی سۆراغێکی دەکەین".

بۆ سبەینی و دووسبەی و سێ سبەش هیچم نەدۆزیەوە. بەم شێوەیە نۆ رۆژان بەبێ قاچی ڕاست دەچوومە مەشقکردن: حەزم نەدەکرد قاچی خەڵکی دیکە لە خۆم ببەستم. بۆ دەیەمین رۆژ وتیان: " لە باشووری عیراقدا هێرشێکی تازە دەکرێتە سەر دوژمن؛ دەتنێرینە جەنگ!".

وتم:" من ناتوانم، چونکە قاچی راستم نیە". وتیان:" قەیناکە! قاچێکت دەدەینێ". نایب عەریف مەجنوون لەگەڵم هات، بردمیە ناو جبەخانە تاریکەکە. قاچێکی لەناو کۆمەڵێک دەست و قاچ و سنگ و ڕانی مرۆڤدا راکێشا؛ دامیێ، وتی:

" هانێ، تاقیی بکەوە!".

قاچەکەم تاقیکردەوە. زۆر کورت بوو. وتم:

ـ ئەم قاچە بۆ من نابێ، گەورەم؛ زۆر کورتە.

قاچێکی دیکەی دەرهێنا، قاچێکی رەشی درێژی تووکن بوو. دایە دەستم، وتی:

ـ ئەی بزانە ئەمە چۆنە!

تەماشایەکم کرد، وتم:
" گەورەم، ئەم قاچە یەکجار درێژە، بۆ من نابێ".
ئەم جارەیان قاچێکی دیکەی ڕاکێشا: قاچێکی خوێناوی، لە سێ چوار لایان گوللەی پێکەوتبوو، شوێنی گوللەکان ڕەشهەڵگەڕابوون. وتی:
" هانێ، ئەمەیان!".
من، کە دەمویست بزربوونی قاچم بکەمە هەنجەت بۆئەوەی نەمنێرنە سەنگەری شەڕ، وتم:
" گەورەم، ئەم قاچە گوللەی پێکەوتووە، جگە لەوەش زۆر ناشیرینە".
نایب عەریفەکەمان بەم قسەیەم تووڕەبوو. لەناکاو سەری خۆی لێکردەوە و داینایە سەر مێزەکەی بەردەمی؛ وتی:
" سەیرکە، من تەنانەت سەریشم سەری خۆم نیە، کەچی سبەینێ، وەکو تۆ، دەبێ بچمە سەنگەری شەڕ".
پاشان سەری خۆی هەڵگرتەوە و خستیەوە شوێنی خۆی. توند و تووڕەتر درێژەی بە قسەکانی دا:
" تۆ تەنیا قاچی ڕاستت نیە، کەچی پێت سوغرەیە لەگەڵمان بێیتە شەڕ".
من کە ئەم دیمەنە سامناکەم دیت، بەزەییم بە نایب عەریفەکەماندا هاتەوە. لەڕوو مام، نەمزانی چی بڵێم. پاشان گوێم لە ئەو بوو، بە گازاندەیەکی هاوڕێیانەوە، قسەیەکی کرد، کە بەڕاستی، کاری لێ کردم:
ـ ئێوەی کورد هەمووتان هەر وان، هەمیشە دەتانەوێ خۆتان لە ئێمەی عەرەب جیابکەنەوە.
ئەم قسەیە وای لێکردم تەریق ببمەوە، لە دڵی خۆمدا گوتم: " عەیبە، با هەست بەوە نەکات کە من بزربوونی قاچم دەکەمە هەنجەتی نەچوونە جەنگ"؛ " با وایشی لێک نەداتەوە کە کورد ترسنۆکن یان لە شەڕ دەترسێن"، وتم:
" گەورەم، دڵگران مەبە! " بە ناچارییەوە دەستم بۆ ناو قاچەکان



درێژکرد: " دەی، قەیناکە، قاچێکم بدەرێ!".
ـ کامەیان؟
ـ هەر کامێکیان بێت.
کە گەڕامەوە ماڵ، دەمویست بچم جانتا و بارگەی خۆم بپێچمەوە، بۆئەوەی سبەینێ بەرەو سەنگەری شەڕ بەڕێ بکەوم. لەناکاو دیتم قاچە ڕاستە بزربووەکەم نامەیەکی بۆم ناردبوو. بەشپرزەییەوە نامەکەم کردەوە. خەریک بوو لە کەیفخۆشییان شاگەشکە ببم.
قاچە ڕاستە بزربووەکەم لە نامەکەیدا نووسیبووی، کە چەند ڕۆژێک پێش ئێستا، پۆلیس لەناو بازاڕی شارەکەدا داوای ناسنامەیان لێکردووە؛ ئەویش لەبەرئەوەی هیچ ناسنامەیەکی پێ نەبووە، پۆلیسەکان وایانزانیوە فیرارە؛ گوتوویانە:" مادام کوردە و فیراری کردووە، با یەکسەر بینێرینە سەنگەری شەڕ". ئەویش لەناو بازاڕەکەدا خۆی لەدەست پۆلیسەکان ڕاپسکاندووە و ڕایکردووە، هەر بەراکردن و غارەغار تاکو بەغدا ڕانەوەستاوە؛ لەوێش ناسنامەیەکی دەسهەڵبەستی پەیداکردووە و چۆتە گەراجی کندی: سواری پاسێکی هەژدە نەفەری بووە و گەڕاوەتەوە هەولێر.
قاچەڕاستە بزربووەکەم، بەم نامە بەپەلەیەی، بەراستی، سەرتاپای ڕۆح و جەستەمی داچڵەکاند. سەیرم پێدەهات: ئەو قاچە بەستەزمانەم چۆن توانیویەتی بە تاقی تەنیا ئەو جەربەزەییە بکات و خۆی بگەیەنێتەوە هەولێر! لە هەمووی سەیرتر ئەوە بوو کە لەو نامەیەیدا داوای لێکردبووم منیش وەک ئەو فیرار بکەم و بگەڕێمەوە هەولێر. لە نامەکەیدا بە خەتێکی زۆر شپرزە و تێکەڵ و پێکەڵ نووسیبووی:
تکات لێدەکەم بگەڕێوە، من بەبێ تۆ ناتوانم بژیم. بە زووترین کات فیراربکە و وەرەوە هەولێر! ئیدی لێرە چارەسەرێک بۆ خۆمان دەدۆزینەوە، دەچینە ئێران یان دەچینە تورکیا، لەوێشەوە خۆمان دەگەیەنینە ئەورووپا. بۆ خۆمان لەمەودوا لە ئەورووپا بە خۆشی و شادی دەژین...
– بە زووترین کات بگەڕێوە؛ من بەبێ تۆ ناتوانم بژیم...
ئەم قسانە، دوای تەواوکردنی نامەکە، لە مێشکمدا دەزرنگانەوە.

عـارەقـەیەکی سـارد سـەرتاپای لەشـمی داگـرتبـوو.لە ژوورەکـەمـدا دانیشـتبـووم و هەردوو کاژەڵاکم لەناو دەستەکانی خۆمدا راگرتبـوون، دەیان هزری ماندووی جۆراوجۆر بە مێشکمدا تێدەپەڕین.

– بە زووترین کات بگەڕێوە؛ بۆ خۆمان دەچینە ئەورووپا..!

بیرم دەکردەوە: من و رۆح و سەر و مێشکم زۆر لەوە ماندووتر بوون کە بتوانم فیرار بکەم و رێگای جەربەزەیی و چوونە تورکیا ، لەوێشەوە گەیشتنە ئەورووپا بگرمەبەر. بە خـۆم و تەمـەنی بیست و نۆ سـاڵەی خۆمەوە هەسـتـمدەکرد ژیان و داهاتووم، ئەگەرچی لەم جەنگە شـووم و بێـمـانایەشدا بەهەدەر بچـێت، بەڵام ئەوەندە ناهێنێ کـە ئـیدی هیچ جـــەربەزەییـــەکی نەزۆک و غـــەمگـینی دیکەی لەپێناو بکەم. لە ژوورەکـەمـدا ، لەسـەر کـورسـیـەک دانیـشـتم، دەسـتـمـدایە قـەڵەم و کـاغـەزێک، کـەوتمە سـەر نووسـینی نامـەیەک بۆ قـاچە راسـتـە خۆشەویستـەکەم. بە دڵێکی پڕ لە حەژمەت و تاسە و فـیگاری، چاو فرمێسکاوی، نووسییم:

ئەی قاچە خۆشەویستەکەم!

لێم ببـوورە؛ من رۆحم یەکـجـار مـاندووە. لەوانەیە خـۆشت باش هەسـتی پێ بکەی، کـە من لەدەست ژیان و داهاتووی خـۆم رادەکـەم. هەمـیـشـە لەدەست خـۆم رادەکـەم. من هەست دەکـەم توانای هیچ جەربەزەییەکم نەماوە؛ ناشتوانم چیتر چێژ لە خۆشی و جوانییـەکانی ژیان ببـینم: نە لەناو وڵات و نە لە ئەورووپاش. من و نەوەی من، کـۆمـەڵێک گـەنجی بەدبەخت و رەنجـەڕۆ بووین، بووینە قـوربانیی سـەردەمی خۆمان: قـوربانیی شەڕ و جەنگە پیسـەکانی ئەو گـەوج و کەرانەی کە ئەمڕۆ فەرمانڕەوایەتیی ئێمە دەکەن. من زۆر ماندووم، زۆر زۆر مـاندوو. تۆش ئێـتـر، ئەگـەر سـەفـەری ئەورووپات کـرد، سـەفـەری خـۆت بکە و بڕۆ؛ خـوا ئاگـادارت بێ! ئاواتەخـوازم کـە بەخـتـەوەر و سەرکەوتوو بیت ...

**١٩٨٩**



# لامارتین

لە پاریس، شەش حەوت مانگ بوو بەدووای کاردا دەگەڕام. ڕۆژێکیان، کە ئیدی تەنیا بیست فرەنکم لە باخەڵ مابوو، چوومە ئاژانسی ANPE وتم بەڵکو کارێکم دەست بکەوێت و پێی بژیم.
لە سالۆنی ئاژانسەکەدا، لەگەڵ کۆمەڵێک خەڵکی دیکەش: فەرەنسی، غەیرە فەرەنسی؛ کچ، کوڕ، سپی، ڕەش، سوو.. دانیشتبووین و چاوەڕێمان دەکرد. دووای نزیکەی سەعاتێک چاوەڕوانی، کاتێ نۆرەی من هات، چوومە ژوورەوە. لەودیو مێزەکەوە، ژنێک دانیشتبوو، وتی:
– فەرموو!
لەسەر کورسیەکە دانیشتم. ناسنامەکەی خۆم پێی نیشان دا، وتم:
– بێکارم. هاتووم بەدووای کاردا دەگەڕێم.
ناسنامەکەی لێ وەرگرتم، تەماشای بەڵگەنامەکانی ناو دۆسیەکەمی دەکرد، کە لە بەردەمی دانرابوون:
– دەرچووی زانکۆی سۆربۆنیت..
– بەڵێ.
ئنجا بە ڕوویەکی خۆشترەوە، گوتی:
– شارەزاییت لە چ بوارێکدا هەیە؟
وتم:
– لەبارەی قافیە.
ژنەکە کەمێک داما، بێدەنگ بوو، پاشان وتی:
– قافیە چی؟
وتم:
– قافیەی شیعر.
سەری بەرزکردەوە، تەماشای تۆپەڵە هەورێکی ناو ژوورەکەی کرد، وتی:
– تۆ چیت خوێندووە؟
وتم:
– دکتۆرام هەیە.
– لەبارەی..



– قافیە لە شیعرەکانی لامارتین دا.
وتی: دەتەوێ چ کارێک بکەی؟
وتم: هەر کارێک بێ کە بتوانم پێی بژیم.
وابزانم ژنەکە بەم قسەیەم تووڕە بوو، یەکسەر وتی:
– ئێمە ناتوانین بەم شێوەیە کار بۆ خەڵکی بێکار بدۆزینەوە.
سەرم سوڕما، وتم: بۆچی؟
وتی:
– هەر بێکارێک کە دێتە ئەم ئاژانسە و بەدووای کاردا دەگەڕێ، پێویستە شارەزایی لە بوارێک یان لەکارێکدا هەبێ!
منیش تەنگاو بووم، وتم:
– ئێ.. خانم، منیش، وەکو پێم وتی: شارەزاییەکی فراوانم لەبارەی قافیە هەیە؛ چوار ساڵی ڕەبەقە هەر خەریکی خوێندن و لێکۆڵینەوەم لە قافیە. تاکو ئێستا چەندین وتاریشم لەبارەی ئەم مەسەلەیە بڵاوکردۆتەوە.
ژنەکە ماوەیەک بێدەنگ ما، پاشان وتی:
– تۆ پێشتر هیچ کارێکت کردووە؟
ئەم پرسیارە کەمێک نیگەرانی کردم، بەڵام نەمهێشت هیچ شتێک بە ڕوخسارمەوە دیار بێ، وتم:
– ئەی چۆن، خانم!
وتی:
– چی؟
وتم: خانم، من بە درێژایی تەمەنی گەنجیم، وا بۆ نزیکەی یازدە ساڵ دەچێ، شیعر دەنووسم. ئەزموونێکی فراوانم لەبارەی شیعر نووسین هەیە. هەر بۆیەش قافیەم لە شیعرەکانی لامارتین بۆ بڕوانامەی دکتۆراکەم هەڵبژاردووە.
وتی:
– کەواتە تایبەتمەندیت لەبارەی «قافیە» وەگرتووە!
وتم:
– بەڵێ، خانم. قافیە لە شیعرەکانی لامارتین دا.

لەو دەمەدا پشیلەیەک هاتە سەر مێزەکە. ژنەکە تەماشایەکی کردم، وتی:
– بە پشیلە ئیزعاج نابیت؟
تەماشایەکی پشیلەکەم کرد، وتم:
– بە هیچ شێوەیەک.
ژنەکە گوڵێکی لە چەکمەجەی مێزەکە دەرهێنا، بەئەسپاییەوە بۆنی کرد، ئینجا بەکاوەخۆ وتی:
– باشە!.. ئێمە، لقێکی ئاژانسەکەمان شیعر دەکڕێت و دەفرۆشێتەوە؛ بەڵام...
– بەڵام چی، خانم؟
–ئێمە بۆ ئەم جۆرە کارە چەند مەرجێکمان هەیە.
– مەرجەکان چین، خانم؟
ژنەکە دەستی بەکلکی پشیلەکەدا دەهێناو تەماشای کاغەزێکی بەردەم خۆی دەکرد، وتی:
– پێش هەموو شتێک پێویستە ئێمە پشیلەکان بخوێنینەوە!
– مەبەستت شیعرەکانە؟
– بەڵێ. دەبێ بەدڵمان بن. مەرجی دووەمیش ئەوەیە کە لەسەرەتادا، واتە لە ڕۆژی سپاردنی شیعرەکانت بە ئاژانسەکەمان، پێویستە سێزدە هەزار فرەنک بنوێنیت.
– نواندنی ئەم سێزدە هەزار فرەنکە بۆ چیە، خانم؟
– چونکە لە حاڵەتێکدا ئەگەر شیعرەکانت بە دڵی لیژنەکە نەبوو، ئەوا نیوەی ئەو پارەیەت لێ دەگێڕینەوە.
– ئەدی ئەگەر بەدڵتان بوو؟
– بێگومان لێت دەکڕن.
– کیلۆی بە چەند؟
– ئێمە بە کیلۆ نایکڕین. دانە دانە دەیکڕین. شیعری کلاسیک: پێنج سەد فرەنک؛ شیعری ئازاد: سێ سەد فرەنک؛ پەخشانە شیعر: سەدو پەنجا فرەنک؛ چوارین و پێنج خشتەکی و ئەم جۆرە شیعرانەش: سەد فرەنک.



– ئەدی مەرجەکانی دیکە چین؟
– ئێمە لیژنەیەکمان هەیە کە ساڵی جارێک دادەنیشێ، شیعری شاعیران هەڵدەبژێرێ... وەڵامی ڕازی بوون و نەبوونیش، هەمیشە دووای هەشت مانگ بۆ شاعیرەکە دەنێردرێتەوە. چونکە هەموو ساڵێک خەڵکێکی یەکجار زۆر شیعری خۆیان بۆ فرۆشتن پێشکەش بەم ئاژانسەی ئێمە دەکەن.
– سوپاس.
ئەمەم بە ژنەکە گوت و، بێدەنگ، هەڵسام ڕۆیشتم.

دەستم لەناو گیرفانی پاڵتۆ، غەمگین، بەدەم پیاسەوە، گەیشتمە سەر شەقامی (سانت ژێرمەن دێ پغێ). لەوێ، لە مەیدانێکی بچکۆڵەدا، لە تەنیشت کیوسکێک، لەو شوێنەی کە پەیکەرێکی لامارتینی لێیە، چووم ڕاوەستام. کەمێک دوور لە پەیکەرەکەوە، وەک ئەوەی ئەمە یەکەمین جار بێ تەماشای ئەو پەیکەرەی لامارتین بکەم، کەوتمە ووردبوونەوە لەو پەیکەرە بەرز و شکۆمەندەی لامارتین: شاعیری گەورەی فەرەنسای سەدەی نۆزدەهەم، بە جلوبەرگێکی ڕێکپۆش و کەشخەوە، شاهانە، دانیشتبوو؛ دەستی ڕاستی لەسەر چۆکی ڕاستی خۆی دانابوو، دەستی چەپیشی بەرز کردبۆوە و پەنجەی بۆ (ئاسامان) درێژ کردبوو، وەک ئەوەی لە حاڵەتی خوێندنەوەی شیعرێکی بێت. پاشان چووم بە ماندوویی و دڵپڕییەوە لەژێر پەیکەرەکەیدا دانیشتم.
هەرکە دانیشتم و دانەنیشتم، لامارتین، لە پشتمەوە، بە دەنگێکی بەرز،– دیاربوو دەیویست دڵم بداتەوە– وتی:
– نیگەران مەبە!
منیش دانوشتابوومەوە، بێ ئەوەی سەرم بەرزبکەمەوە، لەبەر خۆمەوە وتم:
– چۆن نیگەران نەبم؟
لامارتین، لەپشت سەرمەوە، بە دەنگێکی زگار و خەفەتناکەوە وتی:
– ئەوەیە ئیتر..!

سەرم بەرزکردەوە، ڕووەو هاتوچۆی ئوتومبیلە ڕاکردووەکانی سەر شەقام، وەک ئەوەی بەوێ کە تەنیا خۆم بدوێنم:

– من ئەگەر سێزدە هەزار فرەنکم هەبووایە و بمتوانیایە تاکو هەشت مانگی دیکە چاوەڕێ بکەم، بۆچی دەچوومە لایان بپاڕێمەوە بۆ کار؟ چ حەوجەم بەکار هەبوو؟

لامارتین یەکسەڵەف وتی:

– تۆ لە سەرەتاوە نەدەبووایە چارەنووسی خۆت بدەیتە دەست شیعر و جوانی و نووسینەوە!

کە ئەم قسەیەم لە لامارتین بیست، یەکسەر ئاوڕێکی تووڕەم لێی دایەوە و وتم:

– ئەی تۆ؟ تۆ بۆچی چارەنووسی خۆت دایە دەست شیعر و جوانی و نووسینەوە؟

بەتووڕەییەوە وتی:

– من کەر بووم.

بێدەنگ، هیچ وەڵامم نەدایەوە. دەمزانی کە لامارتینیش وەک من دڵی پڕە، پێویستی بەوە هەیە کە خۆی تاوانبار بکات و خۆی تێک بشکێنێ: بۆ ئەوەی هیچ نەبێ دڵی کەمێک ئارام بگرێ.

ڕووم کردەوە سەر شەقامەکە، وتم:

– بەڕاستی، ئێمەومانان، ئێمەی هونەرمەند و شاعیران جێگای بەزەیین! زۆر جاران هەست دەکەم کە شەیتانێک، هەر لە ئەزەلەوە ئێمەی بە بەدبەختی فرچک داوە.

بە نیگارییەکی قووڵەوە، نائارام، چاوم بەملاو بەولای خۆمدا دەگێڕا. هەستم دەکرد دڵ و ڕۆحم، ئەژنۆکانم دەلەرزین.

پاشان بە دەنگێکی زەبوون، بەڵام بەرز، بۆ ئەوەی لامارتین گوێی لێم ببێت، وتم:

– ببوورە، مسیۆ لامارتین.. دەتوانی بۆ چەند ڕۆژێک سەد فرەنکێکم بەقەرز بدەیتێ؟

چاوم لەبەر خۆم نابوو. چاوەڕێی وەڵام بووم، بەڵام هیچم نەبیست. پاشان ئاوڕێکم بۆ دوواوە دایەوە، دیتم لامارتین لەوێ نەمابوو.



تەماشای لای چەپی خۆم کرد، دیتم لامارتین لەولاوە، قاپووتەکەی بەسەر شانی خۆی داداوە و دەڕوا. بەدووای کەوتم. یەک دوو جاران بانگم کرد: «مسیۆ لامارتین»! لە بەردەم قاوەخانەکەدا ڕاوەستا. پەلە دیاربوو. وتم:

– دەڕۆی؟

وتی:

– ئا، درەنگە. دەبێ بچمە سەر کار.

وتم: لە کوێ کار دەکەی؟

وتی:

– لە هوتێلێک.

وتم: بە شەوان؟

وتی:

– ئا. حەڕەسم. شەوان پاسەوانیی هوتێلێک دەکەم.

دەمویست لێی بپرسم بزانم شەوی بە چەند کار دەکا، بەڵام لەبەر ئەوەی دەمزانی پەلەیەتی و دەیەوێ بەپەلە بگاتە مێترۆ بۆ سەر کارەکەی؛ لێم پرسی:

– مسیۆ لامارتین؛ ناتوانی لای خۆتەوە لەم لا و لەولا بۆم بپرسی، بەڵکو کارێکم بۆ بدۆزێتەوە ؟

وتی:

– تۆ خۆشت دەزانی، منی تەنیا و غەریب لە پاریس کەس ناناسم.

بە سەرسوڕماوییەوە گوتم:

– تۆ، لە پاریس، کەس ناناسیت ؟

– بەڵێ، برادەر، من و تۆ خەڵکی سەدەی نۆزدەمین؛ کەس نامانناسێ. بەڵام لەگەڵ ئەوەش، بۆت دەپرسم. جارێ بەدوعا. دەبێ بگەمە سەر کارەکەم.

لامارتین کە بەجێمی هێشت، بەدەم ڕێگاوە ئاوڕێکی بەپەلەی لێم دایەوە، وتی:

– من لە هوتێلێک پاسەوانم. ئەگەر هاتی سەرم لێ بدەی: لە نزیک میترۆی (کادێ)، شەقامی (تغێڤیز)، ژمارە (٧)، هۆتێل (پریما).

جارێ بەدوعا.

لامارتین، ماندوو، بەرەو میترۆ ڕایدەکرد. هەنگاوەکانیشی، جار بەجار ئاوڕیان لە شوێنی پەیکەرەکەی خۆی دەدایەوە و هۆن هۆن دەگریان...

**پاریس: ١٩٩١**



# پەناهەندە

ئێــوارەیەک، پەناهەندەیەکی کــورد، لە شــاری مــیــوونخ، چوو لە گازینۆیەک دانیشت. گارسۆنەکە هات لێی پرسی :

ــ فەرموو، چی دەخۆیتەوە ؟

پەناهەندەکەش وتی :

ــ زەحمەت نەبێ، دە مۆز !

گارسۆنەکە، دووای ماوەیەک، دە مۆزی لە ناو سەبەتێک بۆ هێنا و داینایە سەر مێزەکە .

پەناهەندەکە، زۆر بە تاسووقەوە، مۆزی یەکەمی خوارد و پەلکەکەی فڕێ دایە سەر شۆستەکە، مۆزی دووەمی خوارد و پەلکەکەی فڕێ دایە سەر شۆستەکە، مۆزی سێیەمی خوارد و پەلکەکەی فڕێ دایە سەر شۆستەکە، مۆزی چوارەمی خوارد و پەلکەکەی فڕێ دایە سەر شۆستەکە، مۆزی پێنجەمی خوارد و پەلکەکەی فڕێ دایە سەرشۆستەکە، مۆزی شەشەمی خوارد و پەلکەکەی فڕێ دایە سەر شۆستەکە، مۆزی حەوتەمی خوارد و پەلکەکەی فڕێ دایە سەر شۆستەکە، مۆزی هەشتەمی خوارد و پەلکەکەی فڕێ دایە سەر شۆستەکە، مۆزی نۆیەمی خوارد و پەلکەکەی فڕێ دایە سەر شۆستەکە، مۆزی دەیەمی خوارد و پەلکەکەی فڕێ دایە سەر شۆستەکە.

گارسۆنەکە لەناکاو هاتەوە لای، ڕووی لە پەناهەندەکە کرد، بە تووڕەییەوە وتی: «کاکە تۆ بۆچی مۆزی یەکەمت خوارد و پەلکەکەت فڕێ دایە سەر شۆستەکە، مۆزی دووەمت خوارد و پەلکەکەت فڕێ دایە سەر شۆستەکە، مۆزی سێیەمت خوارد و پەلکەکەت فڕێ دایە سەر شۆستەکە، مۆزی چوارەمت خوارد و پەلکەکەت فڕێ دایە سەر شۆستەکە، مۆزی پێنجەمت خوارد و پەلکەکەت فڕێ دایە سەر شۆستەکە، مۆزی شەشەمت خوارد و پەلکەکەت فڕێ دایە سەر شۆستەکە، مۆزی حەوتەمت خوارد و پەلکەکەت فڕێ دایە سەر شۆستەکە، مۆزی هەشتەمت خوارد و پەلکەکەت فڕێ دایە سەر شۆستەکە، مۆزی نۆیەمت خوارد و پەلکەکەت فڕێ دایە سەر شۆستەکە، مۆزی دەیەمت خوارد و پەلکەکەت فڕێ دایە سەر شۆستەکە ؟» .

پەناهەندەکەش وتی: « بۆچی، من مافی ئەوەم نیە کە مۆزی یەکەم بخۆم و پەلکەکەی فڕێ بدەمە سەر شۆستەکە، مۆزی دووەم بخۆم و پەلکەکەی فڕێ بدەمە سەر شۆستەکە، مۆزی سێیەم بخۆم و پەلکەکەی



فڕێ بدەمە سەر شۆستەکە، مۆزی چوارەم بخۆم و پەلکەکەی فڕێ بدەمە سەر شۆستەکە، مۆزی پێنجەم بخۆم و پەلکەکەی فڕێ بدەمە سەر شۆستەکە، مۆزی شەشەم بخۆم و پەلکەکەی فڕێ بدەمە سەر شۆستەکە، مۆزی حەوتەم بخۆم و پەلکەکەی فڕێ بدەمە سەر شۆستەکە، مۆزی هەشتەم بخۆم و پەلکەکەی فڕێ بدەمە سەر شۆستەکە، مۆزی نۆیەم بخۆم و پەلکەکەی فڕێ بدەمە سەر شۆستەکە، مۆزی دەیەم بخۆم و پەلکەکەی فڕێ بدەمە سەر شۆستەکە !» .

لەم سەین و بەینەدا، خاوەن گازینۆکە، کە پیاوێکی قەڵەوی سوورکەڵەی سمێڵ فش بوو، هاتە ناوبژیانەوە؛ لە گارسۆنەکەی پرسی :«چییە ئەوە ؟ ئەم هەرایە چییە ؟» . گارسۆنەکە وتی:

« پەناهەندەیە! مۆزی یەکەمی خواردووە و پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی دووەمی خواردووە و پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی سێیەمی خواردووە وپەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی چوارەمی خواردووە و پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی پێنجەمی خواردووە و پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی شەشەمی خواردووە و پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی حەوتەمی خواردووە و پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی هەشتەمی خواردووە و پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی نۆیەمی خواردووە و پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی دەیەمی خواردووە و پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە » .

خاوەن گازینۆکە، بە تووڕەییەوە بە پەناهەندەکەی وت:

« تۆ هەرگیز مافی ئەوەت نیە مۆزی یەکەم بخۆیت و پەلکەکەی فڕێ بدەیتە سەر شۆستەکە، مۆزی دووەم بخۆیت و پەلکەکەی فڕێ بدەیتە سەر شۆستەکە، مۆزی سێیەم بخۆیت و پەلکەکەی فڕێ بدەیتە سەر شۆستەکە، مۆزی چوارەم بخۆیت و پەلکەکەی فڕێ بدەیتە سەر شۆستەکە، مۆزی پێنجەم بخۆیت و پەلکەکەی فڕێ بدەیتە سەر شۆستەکە، مۆزی شەشەم بخۆیت و پەلکەکەی فڕێ بدەیتە سەر شۆستەکە، مۆزی حەوتەم بخۆیت و پەلکەکەی فڕێ بدەیتە سەر شۆستەکە، مۆزی هەشتەم بخۆیت و پەلکەکەی فڕێ بدەیتە

سەرشۆستەکە، مۆزی نۆیەم بخۆیت و پەلکەکەی فڕێ بدەیتە سەر
شۆستەکە، مۆزی دەیەم بخۆیت و پەلکەکەی فڕێ بدەیتە سەر شۆستەکە
! ». پاشان دەم و دەست، چوو تەلەفۆنی بۆ پۆلیس کرد. هێندەی پێ
نەچوو پۆلیس گەیشتنە سەری. ئەفسەری پۆلیس، پیاوێکی چوار
شانەی سوور و سپی، دارێکی لە دەست بوو، بە پەناهەندەکەی وت :
« ئایا راستە کە تۆ مۆزی یەکەمت خواردووە و پەلکەکەت فڕێ
داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی دووەمت خواردووە و پەلکەکەت فڕێ
داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی سێیەمت خواردووە و پەلکەکەت فڕێ
داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی چوارەمت خواردووە و پەلکەکەت فڕێ
داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی پێنجەمت خواردووە و پەلکەکەت فڕێ
داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی شەشەمت خواردووە و پەلکەکەت فڕێ
داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی حەوتەمت خواردووە و پەلکەکەت فڕێ
دەوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی هەشتەمت خواردووە و پەلکەکەت فڕێ
داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی نۆیەمت خواردووە و پەلکەکەت فڕێ
داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی دەیەمت خواردووە و پەلکەکەت فڕێ
داوەتە سەر شۆستەکە ؟ ».

پەناهەندەکەش، لەبەر ئەوەی هێشتە مافی پەناهەندەیی لە ئەڵمانیا
بۆ دەرنەچوو بوو و هیچ ناسنامەیەکی پێ نەبوو، شڵەژا، دەیزانی
دەیگرن؛ بە ترس و لەرزەوە وتی: « نەخێر، من هەرگیز مۆزی یەکەمم
نەخواردووە و پەلکەکەی فڕێ بدەمە سەر شۆستەکە، مۆزی دووەمم
نەخواردووە و پەلکەکەی فڕێ بدەمە سەر شۆستەکە، مۆزی سێیەمم
نەخواردووە و پەلکەکەی فڕێ بدەمە سەر شۆستەکە، مۆزی چوارەمم
نەخواردووە و پەلکەکەی فڕێ بدەمە سەر شۆستەکە، مۆزی پێنجەمم
نەخواردووە و پەلکەکەی فڕێ بدەمە سەر شۆستەکە، مۆزی شەشەمم
نەخواردووە و پەلکەکەی فڕێ بدەمە سەر شۆستەکە، مۆزی حەوتەمم
نەخواردووە و پەلکەکەی فڕێ بدەمە سەر شۆستەکە، مۆزی هەشتەمم
نەخواردووە و پەلکەکەی فڕێ بدەمە سەر شۆستەکە، مۆزی نۆیەمم
نەخواردووە و پەلکەکەی فڕێ بدەمە سەر شۆستەکە، مۆزی دەیەمم
نەخواردووە و پەلکەکەی فڕێ بدەمە سەر شۆستەکە ».
پۆلیسەکان چوونە لای ژنێک، کە ماوەیەکی زۆر بوو لە گازینۆکەدا



لە تەنیشت پەناهەندەکە دانیشتبوو، لێیان پرسی: «ئەرێ زەحمەت
نەبێ، خانم؛ ئایا تۆ دیوتە ئەم پەناهەندەیە مۆزی یەکەم بخوات و
پەلکەکەی فڕێ بداتە سەر شۆستەکە، مۆزی دووەم بخوات و پەلکەکەی
فڕێ بداتە سەر شۆستەکە، مۆزی سێیەم بخوات و پەلکەکەی فڕێ
بداتە سەر شۆستەکە، مۆزی چوارەم بخوات و پەلکەکەی فڕێ بداتە
سەر شۆستەکە، مۆزی پێنجەم بخوات و پەلکەکەی فڕێ بداتە سەر
شۆستەکە، مۆزی شەشەم بخوات و پەلکەکەی فڕێ بداتە سەر
شۆستەکە، مۆزی حەوتەم بخوات و پەلکەکەی فڕێ بداتە سەر
شۆستەکە، مۆزی هەشتەم بخوات و پەلکەکەی فڕێ بداتە سەر
شۆستەکە، مۆزی نۆیەم بخوات و پەلکەکەی فڕێ بداتە سەر شۆستەکە،
مۆزی دەیەم بخوات و پەلکەکەی فڕێ بداتە سەر شۆستەکە ؟». ژنەکەش
وتی : «ئەم پیاوە ؟ مۆزی یەکەمی خواردبێت و پەلکەکەی فڕێ دابێتە
سەر شۆستەکە، مۆزی دووەمی خواردبێت و پەلکەکەی فڕێ دابێتە سەر
شۆستەکە، مۆزی سێیەمی خواردبێت و پەلکەکەی فڕێ دابێتە سەر
شۆستەکە، مۆزی چوارەمی خواردبێت و پەلکەکەی فڕێ دابێتە سەر
شۆستەکە، مۆزی پێنجەمی خواردبێت و پەلکەکەی فڕێ دابێتە سەر
شۆستەکە، مۆزی شەشەمی خواردبێت و پەلکەکەی فڕێ دابێتە سەر
شۆستەکە، مۆزی حەوتەمی خواردبێت و پەلکەکەی فڕێ دابێتە سەر
شۆستەکە، مۆزی هەشتەمی خواردبێت و پەلکەکەی فڕێ دابێتە سەر
شۆستەکە، مۆزی نۆیەمی خواردبێت و پەلکەکەی فڕێ دابێتە سەر
شۆستەکە، مۆزی دەیەمی خواردبێت و پەلکەکەی فڕێ دابێتە سەر
شۆسەتەکە ! نەخێر، من نەمدیوە ».
پۆلیسەکان، سەرەڕای ئەوەش، کەلەپچەیان لە دەستی پەناهەندەکە
کرد و رایانپێچا، بە سواری جێبێکی پۆلیسییەوە بردیانە پۆلیسخانە.
لەوێ، بەڕێوەبەری پۆلیسخانە زۆر بە توند و تیژییەوە بە پەناهەندەکەی
دەوت:
« چما تۆ چیت؟ مۆزی یەکەم بخۆیت و پەلکەکەی فڕێ بدەیتە سەر
شۆستەکە، مۆزی دووەم بخۆیت و پەلکەکەی فڕێ بدەیتە سەر
شۆستەکە، مۆزی سێیەم بخۆیت و پەلکەکەی فڕێ بدەیتە سەر
شۆستەکە، مۆزی چوارەم بخۆیت و پەلکەکەی فڕێ بدەیتە سەر
شۆستەکە، مۆزی پێنجەم بخۆیت و پەلکەکەی فڕێ بدەیتە سەر

شۆستەکە، مۆزی شەشەم بخۆیت و پەلکەکەی فڕێ بدەیتە سەر شۆستەکە، مۆزی حەوتەم بخۆیت و پەلکەکەی فڕێ بدەیتە سەر شۆستەکە، مۆزی هەشتەم بخۆیت و پەلکەکەی فڕێ بدەیتە سەر شۆستەکە، مۆزی نۆیەم بخۆیت و پەلکەکەی فڕێ بدەیتە سەر شۆستەکە، مۆزی دەیەم بخۆیت و پەلکەکەی فڕێ بدەیتە سەر شۆستەکە؟ ».

پەناهەندەکەش، هەر هاواری دەکرد، دەیگوت: « نەخێر، نەخێر؛ خۆ من شێت نیم؟ من چۆن هەڵەی وا دەکەم: بێم مۆزی یەکەم بخۆم و پەلکەکەی فڕێ بدەمە سەر شۆستەکە، مۆزی دووەم بخۆم و پەلکەکەی فڕێ بدەمە سەر شۆستەکە، مۆزی سێیەم بخۆم و پەلکەکەی فڕێ بدەمە سەر شۆستەکە، مۆزی چوارەم بخۆم و پەلکەکەی فڕێ بدەمە سەر شۆستەکە، مۆزی پێنجەم بخۆم و پەلکەکەی فڕێ بدەمە سەر شۆستەکە، مۆزی شەشەم بخۆم و پەلکەکەی فڕێ بدەمە سەر شۆستەکە، مۆزی حەوتەم بخۆم و پەلکەکەی فڕێ بدەمە سەر شۆستەکە، مۆزی هەشتەم بخۆم و پەلکەکەی فڕێ بدەمە سەر شۆستەکە، مۆزی نۆیەم بخۆم و پەلکەکەی فڕێ بدەمە سەر شۆستەکە، مۆزی دەیەم بخۆم و پەلکەکەی فڕێ بدەمە سەر شۆستەکە !».

بۆ سبەینێ، ڕۆژنامەنووس لە ڕۆژنامەکانی خۆیاندا چەندین ڕاپۆرت و وتاریان لە بارەی ئەم مەسەلەیە بڵاو کردەوە و لە وتارەکانیاندا، بە مانشێت و خەتی درشت، نووسیان کە پەناهەندەیەکی کورد لە گازینۆیەکی شاری (میوونخ)دا داوای دە مۆزی کردووەو پاشان مۆزی یەکەمی خواردووە و پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی دووەمی خواردووە و پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی سێیەمی خواردووە و پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی چوارەمی خواردووە و پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی پێنجەمی خواردووە و پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی شەشەمی خواردووە و پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی حەوتەمی خواردووە و پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی هەشتەمی خواردووە و پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی نۆیەمی خواردووە و پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی



دەیەمی خواردووە و پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە .

بۆ ئێوارەی هەمان ڕۆژ، ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی ئەڵمانیش هەمان دەنگوباسیان بەم شێوەیەی خوارەوە بڵاو کردەوە: «پەناهەندەیەکی کورد کە یازدە ساڵە لە ئەڵمانیا دەژیت و هێشتە مافی پەناهەندەیی بۆ دەرنەچووە، بەم دووایییە ئەقڵی تێک چووە. دوێنێ ئێوارە لە گازینۆیەکی شاری (میوونخ)دا پۆلیس بینیویانە کە داوای دە مۆزی کردووە، پاشانیش مۆزی یەکەمی خواردووە و پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی دووەمی خواردووە و پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی سێیەمی خواردووە و پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی چوارەمی خواردووە و پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی پێنجەمی خواردووە و پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی شەشەمی خواردووە و پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە،مۆزی حەوتەمی خواردووە و پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی هەشتەمی خواردووە و پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی نۆیەمی خواردووە و پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی دەیەمی خواردووە و پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە ».

**پاریس – ١٩٩٢/٧**

# پەتــــاتــــەخۆرەکان



گەر بێـی و بچیەوە، کانە دیسان
سەفەر دەکەی لە وەتەن و دەچیە شاری جابولقا
**«ح. ق. کۆیی»**

فـەرەیدوون، کـاتێ سـەری خۆی هەڵگرت و گـوندەکـەی خۆیانی جێ هێشت، دووا بە دووای ئەو، لە گوندەکەیاندا بووە مقۆ مقـۆ: هەر کەسە و قسـەیەکی دەکـرد. هەندێ کـەس دەیانگوت " چووە بۆ ئەڵمانیـا "، هەندێکی تر دەیانگوت " گەیشـتـۆتە سـوێد "، هەندێ دەیانگوت " لە کـەنەدایە "، هەندێکی دیکەش وایان باسـدەکـرد کـە لە کـوڵۆمـبـیـا گیرساوەتەوە و قاچاغچێتیی حەشیشە دەکا. برادەرە نزیکەکانیشی دەیانگوت " لە دانیمارک ژنێکی پۆڵۆنیی هێناوە و لە چێشتخانەکان ئیش دەکـا ". لە هەمـوویشی سـەیرتر ئەوە بوو کـە خـوشک و براکـانی خۆی دەیانگوت : " ئێمە نامەی ئەومان لە ئەمریکاوە پێدەگات و دەڵێ لە ئەمریکام".

فەرەیدوون، ئەو کاتەی گوندەکەی خۆیانی جی هێشت، تاعـوونێکی پیس لە گوندەکـەیانـدا بڵاوبـبـۆوە. خەڵک ـ لەخـۆیانەوە ـ دەرشـانەوە، سی چوار رۆژێک لەناو جێگەدا دەکـەوتن، پاشان کـەڵەواژدەبوونەوە و دەمردن. فەرەیدوون سەبارەت بەم تاعـوونە بوو سەری خۆی هەڵگرت و رۆیشت. تاعوونەکەش سێزدە ساڵی رەبەق درێژەی کێشا.
ئێـسـتـاش ئەوەتا، کـە تاعـوونەکە کـۆتایی پێ هاتووە، فـەرەیدوون، پاش سـێـزدە ساڵ دوورەوڵاتی و خانەبەکۆڵی، گەڕاوەتەوە گـوندەکـەی خۆیان !

فەرەیدوون کە گەڕایەوە، وەک هەر ئێوارەیەکی رۆژگاری جاران کە لە چایـخانەیەک گەڕابێتەوە، هاتەوە بەردەم ماڵەکەی خۆیان: تەنیـا یەک جانتای پێ بوو؛ بەڵام جانتایەکی گەورە و پڕ.

فەرەیدوون ئاگای لێ نەبوو: خەڵکی گوندەکەی حۆیان، لە ماوەی ئەم

سێزده ساڵە تاعووناوییەدا، گەلێک داب و نەریتی خۆیان لەدەست دابوو، چەند رەوشت و ئاکارێکی تازەیان پەیدا کردبوو. لە هەمووی سەیرتر: عادەتی پەتاتەخواردن بوو! ئەم عادەتی پەتاتە خواردنە، کاتی خۆی، لە برسان، لەگەڵ دەسپێکردنی تاعوونەکەدا، دووای رۆشتنی فەرەیدوون، بەناو خەڵکی گوندەکەدا بڵاوببۆوە.

خەڵک، لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی تاعوون، ورده ورده هەموو خواردنێکیان لە پێش چاو کەوتبوو؛ ساڵ بە ساڵ زیاتر و زیاتر بێزییان لە خواردن دەکردەوە: تەنیا پەتاتەیان دەخوارد. بۆ کشتوکاڵیش، تەنیا پەتاتەیان دەچاند. لە دەشتەکاندا، لەناو باخچەی ماڵ و پێش دەرگاکان، تەنانەت لە چایخانە و قوتابخانەکانیشدا، تەنیا پەتاتەیان دەچاند. ئاوی پەتاتەیان دەخواردەوە. ئەوەی کەمێک دەوڵەمەند بووایە و حاڵی باشتر بووایە شەربەتی پەتاتەی دەخواردەوە. ئاغا و ئەفەندی و پیاوماقووڵەکانیش، بیرەی پەتاتە و شەرابی پەتاتە و عارەقی پەتاتەیان دەخواردەوە. ئەوانەی هەژار بوون، زستانان ئاوی پەتاتەیان وشک دەکردەوە بۆ هاوین. خەڵک، زۆربەی جلوبەرگەکانیان، لە پەڵکی پەتاتە دروست دەکرد. رەسمی پەتاتەی جۆراوجۆریان بە دیواری ماڵ و چایخانەکاندا هەڵدەواسی. سەرفیترە و زەکاتیشیان هەر بە پەتاتە بوو. لە کاتی ژن گواستنەوە و چللە و حەفتانە و بۆنەکانی دیکەشدا جوانترین دیارییان تەنیا پەتاتە بوو. تەنانەت کاتێ کەسێکیشیان لێ دەمرد، بە ئاوی پەتاتە دەیانشۆردەوە؛ لە کۆتاییدا سەلکە پەتاتەیەکیشیان، لەگەڵ مردووەکە، دەخستە گۆڕەکەیەوە.

برا، باوک. خوشک و خزمەکانی فەرەیدوون، ئەو رۆژە، لە خۆشیی گەڕانەوەی فەرەیدوون، لەگەڵ کەسوکار و ئاشنا و هاوڕێ کۆنەکانی، پێکرا، لە رۆژی گەڕانەوەی فەرەیدووندا، ـ سەرەڕای دەسکورتی و نەداری ـ سێ شەو و سێ رۆژ ئاهەنگیان گێڕا. بە دەهۆڵ و زوڕنا و تیپی ئاهەنگی جۆراوجۆرەوە، شایی و سەمایان دابەست.
لە ماوەی ئەم سێ شەو و سێ رۆژەدا، پەیامنێری هەموو رادیۆ و



تەلەفزیۆنەکان ـ لە شارەوە، هەروەها نوێنەری زۆربەی رۆژنامە وگۆڤارەکان، پەیتا پەیتا دەهاتنە لای فەرەیدوون و چاوپێکەوتنیان لەگەڵ سازدەکرد. رادیۆی فلان حزب رایدەگەیاند "شاعیرێکی زۆر گەورە گەیشتەوە خاکی نیشتیمان"، تەلەفزیۆنی فلان حزب دەیگوت "قوتابییەکی کورد خوێندنی باڵای لە زانکۆیەکی بەرزی ئەمریکا تەواو کردووە و گەڕاوەتەوە گوندەکەی خۆی"، رۆژنامە و گۆڤارەکانیش بە مانشێتی گەورە دەیاننووسی " نووسەرێکی بەهرەدار گەڕایەوە زێدی خۆی بۆئەوەی خزمەتی نەتەوەکەی خۆی بکات".
بەم شێوەیە، لە ماوەی ئەم سێ شەو و سێ رۆژەدا هێندە رێز لە فەرەیدوون گیرا و هێندە پڕۆپاگاندەی بۆ کرا کە فەرەیدوون بووە "گەورەترین شاعیر، دڵسۆزترین مامۆستا، ناودارترین نووسەر"ی وڵاتەکەی خۆی.
فەرەیدوون لە ماوەی ئەم سێ شەو و سێ رۆژەدا وەدەست هیچ کەسێک نەدەکەوت. خزم و کەسوکارەکانی فەرەیدوون، بەردەوام فەرەیدوونیان دەعوەتی ماڵی خۆیان دەکرد. تەنانەت ئەو ماڵە خزمانەی کە هەژاریش بوون، پەتاتەیان لە خزمە دەوڵەمەندەکان قەرز دەکرد بۆئەوەی بتوانن دەعوەتێکی پەتاتەی فەرەیدوون بکەن. ئاغا و پیاوماقووڵ و ئەفەندییەکانی گوندیش دەیانویست دەعوەتی بیرە و نادی و خواردنەوەی پەتاتەی بکەن. هاوڕێ و ئاشنا نزیک و دوورەکانیشی، هەر یەکەیان، کە دەهاتنە لای، سەلکە پەتاتەیەکی رەنگکراویان، لەناو کیسێک، بە دیاری پێشکەش دەکرد.
فەرەیدوون، لە ماوەی ئەم سێ رۆژەی یەکەمدا وای لێهاتبوو خۆیشی، ورده ورده، خەریک بوو لەگەڵ "پەتاتە " رادەهات؛ خواردن و خواردنەوەی پەتاتەی لەلا دەبووە ئاسایی.

شەوی چوارەم، کاتژمێر یازده و نیوی شەو، باوک و خوشک و برا و براژن و زاوا و خاڵ و خاڵۆزا و مام و مامۆزا و پوور و پوورزا و برازا و خوشکەزا و منداڵەکانیان، هەموویان، پێکەوە، لە دیوەخانی ماڵە بابی فەرەیدوون، دووای پەتاتە خواردنی ئێوارە، دەورەیان لە فەرەیدوون دا.

باوکی، رووی کردە فەرەیدوون، گوتی:
ـ دەی فەرەیدوون، کورم، بزانین چیت بۆمان هێناوەتەوە ؟
فەرەیدوون بەم پرسیارە زۆر کەیفخۆش بوو. هەڵسا جانتا گەورە پڕەکەی، بەشانازی و کامەرانییەوە، لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا، لە بەردەم باوکی، هەڵڕشت. فەرەیدوون، لە کەیفخۆشییان شاگەشکە، لە دڵی خۆیدا دەیگوت: " با ببێتە موفاجەئەیەک " !

جانتاکە، وەک فەردە گەنمێک، پەیتا پەیتا، وردە زێڕی وەک ئاردی زەردی درەوشاوەی لێوە دادەڕژا، پاشان پارچە زێڕی گەورە و گەورەتر، ئنجا پارچە زێڕی قەبەی بەقەد کەرپووچێک. فەرەیدوون لە کاتێکدا تەماشای ئەم زێڕە جوانانەی دەکرد، کە چۆن وەک عارەقەی ڕۆحی ماندووی سێزدە ساڵەی دەربەدەریی خۆی، دادەڕژانە خوارەوە، بە دڵخۆشی و بەختەوەرییەکی سەربڵندانەوە وتی:
ـ ئەوەتا، بابە گیان، زێڕم بۆ هێناون.
یەکێک لە براژنەکانی، کە مەمکی دەدایە کۆرپە لەڕەکەی، پرسی:
ـ ئەم جانتایە، هەمووی هەر زێڕە ؟
فەرەیدوون وتی: بەڵێ، هەمووی هەر زێڕە.
خوشکەکەی، بەسەرسوڕمانەوە، بە دەنگێکی کەمێک بەرزتر، پرسییەوە:
ـ هەمووی هەر زێڕە ؟
فەرەیدوون وتی:
ـ بەڵێ، هەمووی هەر زێڕە.
خاڵۆکەی، لە هەموویان سەرسوڕماوتر:
ـ هەمووی هەر زێڕە ؟
ـ بەڵێ، هەمووی هەر زێڕە.
باوکی هەڵیدایە:
ـ یەعنی هیچ پەتاتەت لە خاریج نەهێناوەتەوە ؟
فەرەیدوون: نەخێر، هیچ پەتاتەم لە خاریج نەهێناوەتەوە.
برا گەورەکەی، بە دەنگێکی سەرسوڕماو دەنگی بەرزکردەوە:



ـ هیچ پەتاتەت لە خاریج نەهێناوەتەوە ؟!
فەرەیدوون لە ئەوان سەرسوڕماوتر:
ـ نەخێر، هیچ پەتاتەم لە خاریج نەهێناوەتەوە.
زاواکەی:
– بەڕاست؛ هیچ پەتاتەت لە خاریج نەهێناوەتەوە ؟
ـ نەخێر، هیچ پەتاتەم لە خاریج نەهێناوەتەوە.
خاڵۆکەی، بە حەپەسانەوە، کەمێک تووڕە:
ـ بەڕاست، بەڕاست... تۆ هیچ پەتاتەت لە خاریج نەهێناوەتەوە ؟
ـ نەخێر، من هیچ پەتاتەم لە خاریج نەهێناوەتەوە.
مامەکەی، وەک بیەوێ یەخەی بگرێت و رایتەکێنێ:
ـ تۆ بەڕاستتە ؟ هیچ پەتاتەت لە خاریج نەهێناوەتەوە؟
فەرەیدوون، کەمێک شڵەژا، بەڵام هەر لەسەرەخۆ:
ـ بەڵێ، بەڕاستمە، من هیچ پەتاتەم لە خاریج نەهێناوەتەوە.
پوورزاکەی: یەعنی بەڕاستی، تۆ هیچ پەتاتەت لە خاریج نەهێناوەتەوە؟
فەرەیدوون هەناسەی سوار ببوو:
ـ بەڵێ، بەڕاستی، من هیچ پەتاتەم لە خاریج نەهێناوەتەوە.
پوورەکەی: باشە، تۆ چۆن هیچ پەتاتەت لە خاریج نەهێناوەتەوە؟
فەرەیدوون، تووڕە:
ـ من هیچ پەتاتەم لە خاریج نەهێناوەتەوە.
مامۆزاکەی، وتی:
ـ باشە چۆن ؟ تۆ بۆچی هیچ پەتاتەت لە خاریج نەهێناوەتەوە؟
فەرەیدوون وەک ئەوەی بەرگری لە هەڵە و تاوانێکی خۆی بکات:
ـ نازانم. من هیچ پەتاتەم لە خاریج نەهێناوەتەوە.
کوڕە خاڵەکەی، وتی:
ـ باشە، سەیرە ! تۆ بۆچی هیچ پەتاتەت لە خاریج نەهێناوەتەوە؟
فەرەیدوون، لەسەرەخۆ:
ـ بۆچی سەیرە ؟ من هیچ پەتاتەم لە خاریج نەهێناوەتەوە.
باوکی فەرەیدوون، لە کۆتاییدا، بە خەفەت و کۆستێکی قووڵەوە،

هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا:
ــ باشە؛ بۆچی، کورم ؟ تۆ بۆچی هیچ پەتاتەت لەگەڵ خۆت نەهێناوەتەوە ؟
فەرەیدوون بە لە خۆ ڕازی بوونەوە، لە هەمان کاتدا وەک ئەوەی بیەوێت هێما بۆ نرخ و بایەخی زێڕ بکات، وتی:
ــ من تەنیا زێڕم لەگەڵ خۆم هێناوەتەوە.
خاڵۆکەی، کە پیاوێکی ڕەشتاڵەی چوارشانەی قەفی سمێڵ پان بوو، بە سەرسوڕماوی و کونجکۆڵییەوە پرسی:
ــ زێڕ چییە، کوڕم ؟
فەرەیدوون، لە ئاکامی ئەم گفتوگۆ گەرمەدا، دەمێک بوو تێگەیشتبوو کە هیچ کامێک لەو کەسوکار و خزمانەی، نازانن زێڕ چییە. هیچ کەسێکی دیکەیش لە گوندەکەدا نەیدەتوانی و ناتوانێ لە نرخی زێڕ تێ بگات ! هەیهات ! حەیف ! بەڵام لەگەڵ ئەوەش، هەستی بە شکان و دۆڕان نەدەکرد. کاتێ بیریشی دەکردەوە بچێت نرخی زێڕ و بایەخی زێڕیان بۆ باس بکات، بەلایەوە ئاستەنگ و تا ڕادەیەک بێهوودەش بوو. بۆیە بە غەمگینی و کەمێک بێهوودەییەوە، وەک ئەوەی لە نشوستییەکی گەورەوە هەڵسابێتەوە، سەیرێکی چاوە نەخوێندەوارەکانی خاڵەکەی کرد و بێدەنگ بوو.
براژنەکەی، بە خۆی و کۆرپە لەڕەکەی باوەشییەوە، هەستایەوە سەر پێ، وتی:
ــ پــیــیــف !
چووە دەرەوە. بە دەم ڕێگەشەوە، تۆپەڵە قسەیەکی دیکەی بەردایەوە:
ــ سێزدە ساڵ لە خاریج ژیاوە، کەچی کە هاتۆتەوە، فەردە پەتاتەیەک چییە لەگەڵ خۆی نەهێناوەتەوە !
خاڵۆژنەکەی، جگەرەکەی پەنجەی فڕێدا، هەستایەوە سەر پێ، وتی:
ــ ئەرێ وەڵڵا... پــیــیــف !
ئەویش چووە دەرەوە، وتی:
ــ سێزدە ساڵە نەمانبینیوە، کەچی فەردە پەتاتەیەک چییە بە دیاری



بۆمانی نەهێناوەتەوە !
مامۆژنەکەی، بێدەنگ، هەستایەوە سەر پێ، دەستی منداڵەکەی گرت و ئەویش چووە دەرەوە، بە هەناسەساردی و بەدەم ڕێوە پرتەپرتی بوو:
ـ پەک.. بە زیاد نەبێ ! پەتاتەیەک چییە لەگەڵە خۆت نەیهێنیتەوە !
زاواکەی، بە سەغڵەتی و گازاندەوە، بێ ئەوەی تەماشای فەرەیدوون بکات، چووە دەرەوە و لەبەر خۆیەوە وتی:
ـ هیچ نەبووایە هەر تەنیا چەند پەتاتەیەکت بە دیاری بۆ منداڵەکان هێناباوە !
پوورەکەی، کە لە هەموویان قەڵەوتر بوو، درەنگ گەیشتە بەر دەرگای چوونە دەرەوە، لە حەوشەکە بۆڵە بۆڵی بوو:
ـ خەڵک کە لە خاریج دەگەڕێنەوە بە فەردە پەتاتە لەگەڵ خۆیان دەهێننەوە، کەچی ئەو " شتێکی" هێناوەتەوە کە هیچ سوودێکی نیە... لە خۆێشی زیاتر کەسی دیکە تێناگا چیە !
خاڵۆزا، مامۆزا، پوورزا، خوشکەزا، مام، خاڵ، کوڕە خاڵ... پەیتا پەیتا، یەک لەدووای یەک هەڵدەستانەوە، بە هەناسە ساردییەوە ژوورەکەیان جێدەهێشت؛ بێدەنگ، پشتیان تێدەکرد و دەچوونە دەرەوە؛ دەیانگوت:
ـ سێزدە ساڵان لە خاریج بژیت، چەند پەتاتەیەک چیە لەگەڵە خۆت نەهێنێتەوە !
ـ سێزدە ساڵان لە خاریج بژیت، چەند پەتاتەیەک چیە لەگەڵە خۆت نەهێنێتەوە !
ـ سێزدە ساڵان لە خاریج بژیت، چەند پەتاتەیەک چیە لەگەڵە خۆت...
ـ سێزدە ساڵان لە خاریج بژیت، چەند پەتاتەیەک چیە...
ـ سێزدە ساڵان لە خاریج بژیت، چەند پەتاتەیەک...
ـ سێزدە ساڵان لە خاریج...
خوشکە گەورەکەی، کە برینێکی کۆن بە لاجانگییەوە بوو و دەیانگوت " پاشماوەی چڕنووکی داڵێکی ئەفسانەیی ناو گوندەکەیانە"

بە قوڵپێکی گریانەوە، کەوتە هەنسک، وەک ئەوەی شتێک لە ناخیدا بشکێ، گریا، گوتی:
ـ فەرەیدوون گیان، خۆزگە ئاوها ڕەزیل و سەرشۆڕت نەکردینایە !
ئەویش دەستی منداڵەکەی گرت و چووە دەرەوە.
برا بچووکەکەی، بە تووڕەییەوە، قەڵماسنگی نیگای بڕیە فەرەیدوون و بە ئاوازێکی گاڵتەپێکردنەوە وتی:
ـ '' زێڕ '' چیە ؟
زۆر بە نیگەرانی و تووڕەییەوە، چووە دەرەوە.
برا گەورەکەی، کە پیاوێکی ناسکتر و ڕۆشنبیر بوو، هەستایەوە چووە لای فەرەیدوون، دانوشتایەوە سەری، چاو فرمێسکاوی، تۆپەڵە قسەی غەمگین لە دەمی بەردەبوونەوە:
ـ فەرەیدوون گیان؛ هیچ نەبووایە، تەنیا چەند پەتاتەیەکت بۆ خۆمان بهێنایەتەوە. تۆ وەزعی ئێمەت نەدەزانی چۆنە؟ نەتدەزانی؟ نەتدەزانی لە چ حاڵێکداین ؟

فەرەیدوون، لەسەر چینچکان، وەک لاشەیەکی مردوو، سەری شۆڕکردبۆوە نێوان هەر دوو ئەژنۆی خۆی. بێدەنگ، واق وڕماو، بیری دەکردەوە. لەوەش دەچوو، وەک لە بیابانێک جێ مابێت و کەوتبێتە نێو خەیاڵاتێک کە هیچ ئاگای لە دەوروبەری خۆی نەمابێ.
هەرچی باوکیشیان بوو، کڵۆڵ، هەرەسهێناو، واق وڕماو، وەک تەماشای لاشەی مردووی خۆشەویستێکی خۆی بکات، تەماشای فەردە زێڕە هەڵڕێژراوەکەی بەردەم خۆی دەکرد لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا؛ وەک ئەوەی بە گازاندەوە لە فەرەیدوون بپرسێ:
ـ باشە، ئەم زێڕە چیە، کوڕم ؟ بە کەڵکی چی دێ؟

فەرەیدوون لەناکاو سەری هەڵبڕی، خۆی لە ژوورێکی چۆڵ و هۆڵدا دیتەوە ! وەک لە کۆتایی ئاهەنگێکی گەورەدا کاس بووبێت، سەری کەمێک کەوتبووە ژان. بەڵام دڵی خۆش بوو بەوەی کە هەموویان ڕۆیشتوون و لەم ژوورە چۆڵەدا بەتەنیا جێیان هێشتووە. هەستایەوە



سەر پێ، هەنگاوە فرمێسکاوییەکانی نا بەرەو ڕەسمی دایکە خوالێخۆشبووەکەی، کە بە قەد دیوارەکەی بەرامبەر هەڵواسرابوو: ئەو دایکەی لە کاتی تاعوونەکەدا ـ لە ماوەی دوورەوڵاتیی فەرەیدووندا ـ گیانی سپاردبوو؛ نەیتوانیبوو جارێکی دیکە چاوی پێی بکەوێتەوە؛ ئەو دایکەی کە ئەمڕۆ، ئەم ئێوارەیە، لێرە نەبوو ! لێرە نەبوو، حەیف، بۆ ئەوەی سەری کاسی فەرەیدوون بخاتە سەر سینەی نەرمی خۆیەوە و دڵی بداتەوە. ئەو دایکەی، تاقە کەسێکە لەم وڵاتەی خۆیدا، لە گوندەکەیان، کە نرخی زێڕ تێدەگات و بایەخی زێڕی هێشتا بیر نەچۆتەوە: تاقە کەسێکە کە دەزانێ زێڕ چیە؛ بەڵام حەیف... ئێستا ئەو لەنێو گۆڕێکی سارد و سڕدایە!

**هەولێر: ١٩٩٥ – ١٩٩٦**

# شیزۆ فرینیا



(١)

بەختیار، لەبەردەم ئەفسەرەکە، کە بەرپرسی یەکەمی تۆژینەوەی دۆسیەی بەختیار بوو، وەک ئەسیرێک، دەستەوەستان، راوەستا بوو.

ئەفسەرەکە رووی لە موتەرجیمی بەختیار کرد و وتی:

Il faudrais qu il aille a l Hopital psy-catrique.

موتەرجیمەکە، گەنجێکی کوردی لبنان بوو، ئەم قسەیەی بە خەفەتێکەوە بۆ بەختیار تەرجەمە کرد، وتی:

- کاکە، وا بزانم ماوەیەک دەتنێرن بۆ شەمماعیە.

---

١- ئەگەر دەتەوێ بزانیت بەختیار کێ بوو، بڕوانە گۆشەی ژمارە (١١)

٢- ئەگەر حەز دەکەیت بزانیت ئاخۆ بەختیار چیی بەسەر هات؟ بڕوانە گۆشەی (٥)

(٢)

دایکی بەختیار، هەموو بەیانیەک، لەگوندەکەی خۆیانەوە، بە پاص، دەچووە ناو شار؛ بۆ خزمەتکردنی ماڵە دەوڵەمەندەکان: جلی بۆ دەشوشتن، حەوشە و ژوورەکانی بۆ پاک دەکردنەوە. حەفتەی سێ رۆژانیش (سێ شەممە و چوارشەممە و پێنج شەممە) دەچووە شەمماعیەی هەولێر. لەوێ فەراش بوو.

باوکی بەختیار لە جەولەی شەڕی یەکەمی براکوژیدا بە ئەسیر گیرابوو، بەختیار بەمەی نەدەزانی، تا ئەو رۆژەی نامەیەکی بەدەست گەیشت و هەواڵەکەی خوێندەوە.

---

١- ئەگەر حەزدەکەی بزانیت هەڵوێستی بەختیار، دووای بیستنی ئەم هەواڵە، چی بوو؟ بڕوانە گۆشەی (٧)

٢- ئەگەر حەزدەکەی بزانیت ماڵی بەختیار چیان لەبارەی بەختیارەوە دەگوت. بڕوانە گۆشەی (٨)

(٣)

درونی لدار الشارزور و برده
کفرمیسک گرم الی او سرده

---

١) ئەگەر حەز دەکەی لە واتای ئەم شیعرە تێ بگەی
بڕوانە گۆشەی ژمارە (١٣)
٢- ئەگەر دەتەوێ بزانیت: برادەرەکەی بەختیار بۆچی بەردەوام ئەم شیعرەی بۆ دەخوێندەوە. بڕوانە گۆشەی (١٤)

(٤)

دوو ساڵ و سێ مانگ و چواردە ڕۆژ بوو، بەختیار لەو ئۆردووگایەدا چاوەڕێی دەکرد.
شەوێک - دووای ئەوەی بۆ دووەم جار کە لە پۆلیسی پەناهەندانەوە رەفزی بۆ هاتەوە - کاتژمێر سێی بەیانی بوو، بێ ئاگا، لە خەو هەستایەوە و چووە دەرەوە: لەسەر شەقام، هەرچی جامخانەی دوکان و مغازەکان هەبوو، هەموویانی دایە بەر بەرد؛ زۆربەشیانی بە ئاسنێکی درێژ وردوخاش کرد.
بۆ بەیانی، بەختیار، کە لە پۆلیسخانەی چاوی کردەوە، دەیوت: «من شتی وام نەکردووە. ئاگام لە هیچ نەبووە».

---

١- ئەگەر دەتەوێ بڕیاری پۆلیس لەم بارەوە بزانی،
بڕوانە گۆشەی ژمارە (١)
٢- ئەگەر حەزدەکەی بە دیمەنێکی خەستەخانەکەی بەختیار ئاشنا ببیت، بڕوانە گۆشەی ژمارە (٩)



(٥)

بەختیار بە بیستنی ئەم قسەیە، یەکسەر لە جێی خۆیدا وشک بوو. ویستی رابکات.

---

١- ئەگەر حەز دەکەی بزانیت بەختیار لەسەرچی بانگ کراوەتە پۆلیسخانە
بڕوانە گۆشەی (١٤)
٢- ئەگەر حەز دەکەی بزانیت ئایا بەختیار ناردرایە شەمماعیە یان نا،
بڕوانە گۆشەی ژمارە (٧)

(٦)

- ئەگەر چاک ببیتەوە، حەز دەکەی بگەڕێیتەوە بۆ وڵاتی خۆت؟
ئەمیش وتی:
- پڕ بەدڵ حەز دەکەم بگەڕێمەوە باوەشی دایکم.

---

١- ئەگەر دەتەوێ زیاتر ئاشنای ژیانی دایکی بەختیار بیت،
بڕوانە گۆشەی (٢)
٢- ئەگەر دەتەوێ دێڕە شیعرێکی جوان لەم بارەوە بخوێنیتەوە،
بڕوانە گۆشەی (٣)

(٧)

بەختیار، زۆر نیگەران، پێنج ڕۆژ بوو سەر و ریشی نەتراشیبوو، کاتێ بە دڵتەنگییەوە گەڕایەوە ئۆردووگاکەی خۆی، لەبەردەم دەرگا، تووشی برادەرێکی خۆی هات، ئەویش کورد، لەوێ لەگەڵی پەناهەندە بوو. برادەرەکەی وتی:
– ها.. بەختیار؟ بەختیار، پەست، وەک لەبەر خۆیەوە قسە بکات:
– خەریکە دڵم شەق دەبا، دەگەڕێمەوە.
– بۆ کوێ؟
– بۆ کوردستان.
– بۆ؟
– یان دەبێ بگەڕێمەوە، یانیش ئەوەتا دەبێ بچمە شەمماعیە.

---

١– ئەگەر دەتەوێ شتێک لەبارەی رابردووی بەختیار بزانیت، بڕوانە گۆشەی (١٢)
٢– ئەگەر دەتەوێ بزانیت بەختیار کێ بوو؟ بڕوانە گۆشەی (١١)

(٨)

دایکی بەختیار، خوشکەکانی، دوو براکەی، پوورەکانی، ماڵە خاڵەکانی.. هەموویان ئێرەییان بە بەختیار دەبرد، دەیانوت: «خۆزگە بە بەختیار! بۆ خۆی گەیشتە ئەوروپا!».
ڕۆژێکیان، دایکی بەختیار، لە شەمماعیە، دەستی لە ملی نەخۆشێک کردبوو، ئاوی دەدایە ئەو نەخۆشە، کوڕێکی گەنجی عەرەبی خەڵکی (دیوانیە) بوو، لە دەست ڕژێمی بەغدا رایکردبووە کوردستان. نەیدەتوانی بگەڕێتەوە. دایکی بەختیار بەزەیی بەو گەنجەدا دەهاتەوە، دەشیزانی کە ئێستە وردە وردە خەریکە چاک دەبێتەوە. لێی پرسی:

---

١– ئەگەر دەتەوێ بزانیت دایکی بەختیار چیی لەو کوڕە عەرەبە پرسی، بڕوانە گۆشەی (٦)
٢– ئەگەر دەتەوێ خەونێکی دایکی بەختیار لە بارەی بەختیارەوە بزانیت، بڕوانە گۆشەی (٤)



(٩)

«ئێرە شەمماعیە نییە. باشە، خەستەخانەی سەرپەرشتیکردنی ئەو کەسانەیە کە نەخۆشیی دەروونیان هەیە. موتەرجیمە لبنانیەکە بەهەڵە منی تێگەیاند».
بەختیار، بەدڵخۆشییەوە، لەسەر قەرەوێڵەکە، بە دیشداشەیەکی خەتخەتەوە، وای بە خۆی دەوت.
پیرەژنێکی فەرەنسی، کە لەو خەستەخانەیەدا سستەر بوو، لە دڵەوە بەزەیی بە بەختیاردا دەهاتەوە. ئێوارەیەک لە کاتێکدا جەمی ئێوارەی لەگەڵ پرتەقاڵ و سێوێک لە بەردەم بەختیاردا دادەنا، بەمیهرەبانێکی دایکانەوە دەستی لەملی بەختیار کرد و لێی پرسی:

---

١– ئەگەر دەتەوێ بزانیت ئەم پیرەژنە چیی لە بەختیار پرسی، بڕوانە گۆشەی (٦)
٢– ئەگەر دەتەوێ بزانی: ئەم پیرەژنە بۆچی ئەم پرسیارەی لە بەختیار کرد، بڕوانە گۆشەی (١٤).

(١٠)

بەختیار ماوەیەک لە قەبرستانەکەدا، بە کۆمەڵ، پیسایی و گەڵای وەریوی سەر قەبرستان و ڕێڕەوەکانیان پێ پاک دەکردنەوە. دەیوت: «بوومەتە کەنناس».
ماوەیەکیش دەیانبردن، بەکۆمەڵ، ناو میترۆکانیان پێ گسک دەدان. بەختیار، لەبەر بێ پارەیی، لە هەزار مەتر چوار گۆشەی ئۆردووگاکەیان زیاتر، نەیدەتوانی بجزوێ.
برادەرە فەلەستینی و سریلانکی و لبنانیەکانی، دەچوون قەمصەڵە و جلو بەرگیان لە مغازەکان دەدزی و بە نرخی هەرزان دەیانفرۆشتەوە، پێیی دەژیان. ئەم، ئەم کارەی پێ ناشیرین بوو.

---

١– ئەگەر حەزدەکەی بزانیت چۆن و کەی ئۆفیسی پەناهەندان زانییان بەختیار تووشی «نەخۆشیەکە» بووە، بڕوانە گۆشەی ژمارە(٤)
٢– ئەگەر حەز دەکەی هەندێ شتی تر لەبارەی ژیانی ئێستەی بەختیار بزانیت، بڕوانە گۆشەی (١٥)

**(١١)**

بەختیار پەناهەندەیەکی کوردی عیراق بوو. خەڵکی گوندی «گۆمەسپان»، تەمەنی بیست و یەک ساڵ، لە هەولێر، ئامادەیی کشتوکاڵی تەواو کردبوو.

---

١-ئەگەر دەتەوێ بزانیت بەختیار لە کام وڵات و شار؛ چۆن دەژیا؟
بڕوانە گۆشەی ژمارە (١٥)
٢- ئەگەر حەز دەکەی بزانیت: ماڵی بەختیار کێ بوون و چۆن دەژیان؟
بڕوانە گۆشەی (٢)

**(١٢)**

بەختیار کە گەیشتە فەرەنسا، کۆک و ساغڵەم، هیچ نەخۆشییەکی نەبوو، برادەرە پەناهەندەکانی ناو ئۆردووگاکە دەیانوت:
«ئەم سێ ساڵی چاوەڕوانییە بوو کە بەختیاری ئاوها لێکرد».
بەختیار کە گەیشتە فەرەنسا، تەمای وا بوو بچێت لە «کۆلێژی ئەندازیاری» بخوێنێت؛ لە هەمان کاتدا جار بەجار بتوانێ «کەمێک دۆلاریش» بۆ دایکی بنێرێتەوە.

---

١- ئەگەر حەز دەکەی بزانیت چارەنووسی بەختیار چیی بەسەرهات؟
بڕوانە گۆشەی ژمارە (٧)
٢- ئەگەر دەتەوێ بزانیت گوزەرانی ماڵی بەختیار چۆن بوو؟
بڕوانە گۆشەی (٢)



**(١٣)**

تەنیا دوو لێکدانەوە بۆ ئەم شیعرە هەیە:

---

١- لێکدانەوەیەکی ڕۆژهەڵاتانە،
بڕوانە گۆشەی ژمارە (٨)
٢- لێکدانەوەیەکی ئەورووپاییانە،
بڕوانە گۆشەی ژمارە (٩)

**(١٤)**

لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:
١- بەختیار تووشی نەخۆشیی شیزوفرینیا هاتبوو.
٢- بەختیار شەوان لە خەو هەڵدەستایەوە، دەچوو جامخانەی دوکان و مغازەکانی بازاڕی دەشکاند.
٣- بەختیار زۆر بەتوندی و بە هەستێکی پڕ جۆشەوە غەریبیی دایکی دەکرد و دەگریا.
٤- بەختیار، کە دەیگرت، بەردەوام جنێوی بە حزبەکانی کوردستان دەدا، دەیوت: «ئەوان بوون چارەنووسی منیان تووشی ئێرە کرد». لەمەش خراپتر، جنێوی زۆر ناشیرینی بە خەڵکی فەرەنسی و حکوومەتی فەڕەنسا دەدا.

---

١- ئەگەر حەز دەکەی چەند شتێکی تر لە بارەی ژیانیی غەریبیی بەختیار بزانیت؛ بڕوانە گۆشەی (١٠)
٢- ئەگەر دەتەوێ شتێک لە بارەی رابردووی بەختیار بزانیت؛ بڕوانە گۆشەی (١٢).

## (١٥)

بەختیار لە گوندێکی باشووری شاری پاریس، لە ئۆردووگایەکی یازدە قاتیدا دەژیا. سێ ساڵ بوو چاوەڕێی ئەوەی دەکرد ئیقامەی پەنا هەندەیی بدەنێ.

راستە: بەیانی و نیوەڕۆ و ئێوارە نانیان دەدایە، بەڵام هەر ئەوە بوو، ئیتر: تەنانەت پارەی جگەرە و پارەی بلیتی هاتوچۆشیان نەدەدایە.

هەموو ژیانی، لە کیلۆمەتر چوار گۆشەیەکدا، هەر چاوەڕوانی بوو...کەی ئیقامەکەی دەردەچێت؟!

لەناو هەمان ئۆردووگادا، بەختیار برادەرێکی کوردی هەبوو، دەیوت «شاعیرم».

هەمیشە، ئێواران، شیعرێکی نالی بۆ بەختیار دەخوێندەوە، کە بەم شێوەیە دەست پێدەکات:

---

١- ئەگەر حەز دەکەی شیعرەکە بخوێنیتەوە، بڕوانە گۆشەی (٣)
٢- ئەگەر دەتەوێ زیاتر ئاشنای ژیانی غەریبیی بەختیار ببیت، بڕوانە گۆشەی (١٠)

**پاریس - هەولێر**



# شێر

لە بەر پەنجەرەی ژوورەکەیدا کزەبایەکی سارد لە سەروقژی دەدا؛ غەمگینانە، تەماشای نوالّە بەفرە ئەستوورەکەی بەردەم پەنجەرەکەی دەکرد و لەبەرخۆیەوە دەیگوت: «تەواو ئیتر، لەمەودووا ژیانم هەمیشە ئەم پیاسە سارد وغەمناکەیە» ، « لەم ژووره بچووکەوە بەرەو سەربان، لە سەربانیشەوە بەرەو ژوورەوە » ، «وەک زندانکراوێک» . بە قسەی هاوڕێ پەناهەندە سریلانکی و شیلی و ئێرانی ولبنانییەکان ( کە ئەوان لە پێش ئەمیشەوە بە چەندین مانگ لەم دورگەیەدا ژیاون) لەوانەیە حەوت هەشت مانگی دیکەش، هەر بەم شێوەیە، لە هەمان ئەم دورگەیەدا ژیان بەسەر ببات؛ دووای ئەوەش ئیتر خوا دەزانێ: داخوا ئەمجارەیان رەوانەی دەکەنە کام شاری دووره دەستی ئەم ولاّتە بەستەلّەکە!

لەو دەمەدا، لەناکاو، گوێی لە دەنگی پاپۆڕێک بوو: ورده ورده لە قەراغ دورگەکە دوور دەکەوتەوە، تا گەیشتە بەر نیگای پەنجەرەکەی. پاپۆڕی دورگەکەی خۆیان بوو، وەک هەموو دەمەوعەسرانێکی دیکە، پەناهەندەکانی سوار کردبوو، دەیگەیاندنە کۆپنهاگن. (کۆپنهاگن!) ، ئەویش هەر دورگەیەکی سارد و چۆلّی دیکەیە، وەکو ئێره. بچێتە کۆپنهاگن چی بکا! کێ ببینێ!

لە بەر پەنجەرەی ژوورەکەیدا، سەیری پاپۆڕەکەی دەکرد کە خەریک بوو بەدەم گرەگڕ و کەفکردنی خۆیەوە، ورده ورده، لە دورگەکەیان دوورتر دەکەوتەوە، لەبەرخۆیەوە، بێزار، دلّی خۆی ڕنەک دەدا: «بەڕاستی» ، «بچم لە کۆپنهاگن چ بکەم» «کێ لەوێ دەناسم، کێ دەمناسێ» ؟.

پێش چەند رۆژێک، لە دلّی خۆیدا گوتی: «ناکرێ هەر لە ژوورەوە دانیشم» ، «دەی» ، «با منیش، وەک ئەم هەموو خەلّکە، بۆ چەند ساتێک لەم دورگەیە دوور بکەومەوە؛ هەر هیچ نەبێ هەوایەک بگۆڕم» . لەگەلّ پەناهەندە لبنانی و سریلانکی و پۆلّۆنییەکان، سواری پاپۆڕەکە بوو، چوو بۆ کۆپنهاگن.

پاپۆڕەکە لە کاتژمێر سێ و نیوی پاش نیوەڕۆ گەیشتە کۆپنهاگن، لە بەندەری (ڤێستەپۆرت) رایگرت. هەرکە لە پاپۆڕەکە دابەزیە خوارەوە،



بیری لەوە دەکردەوە کە دەبێت، وەک هەموو پەناهەندەکانی دیکە، لە کاتژمێر شەش و نیوی ئێوارە «واتە دووای سێ کاتژمێری دیکە» لە هەمان ئەم قەراغەی بەندەرەکە ئامادە بێت: بۆ ئەوەی پاپۆڕەکەی لە دەست نەچێت و بتوانێ بۆ نانخواردنی ئێوارە و بۆ شەونوستن بگەڕێتەوە دورگەی خۆی.

کە گەیشتە ناو بازاڕەکەی کۆپنهاگن، کاتژمێر چواری ئێوارە بوو، نەیدەزانی بچێتە کوێ و چی بکات؛ بەناو شەقامەکانی ناوەڕاستی شاردا گەڕا، سووڕا؛ وەک جاری یەکەمی هاتنی بۆ ناو بازاڕی کۆپنهاگن، وەک جاری دووەم، وەک جاری سێیەم، وەک هەموو جارێک، بە تەنیا، بێ پارە و پوولّ، غەریبانە، تەبای منداڵێکی سەرگەردان، چاوی بە کۆگا و جامخانە رەنگینەکاندا دەگێڕا؛ تەماشای ئاپارتمانە شەش قات و یازدە قاتە زێڕەوشانەکانی دەکرد. پەرۆشانە، تینوو، تاو تاو قەلّماسنگی نیگای دەگرتە کچە سوورکەلّە مووزەردە قژئاوریشمییەکان. کە ماندووش دەبوو، لەسەر کورسییەکی ساردی باخچەیەک دادەنیشت، پشوویەکی دەدا، هەلّدەستایەوە، دیسان پیاسە، چاوگێڕان. ئیتر تا شەکەت بوو، هەر گەڕا. لە کۆتاییشدا، کاتێ لە گۆگادەوە، بەرەو قەراغی بەندەرەکەی (ڤێستەپۆرت) گەڕایەوە، هەستی بە غەریبی و تەنیاییەکی کوشندە دەکرد. ئەو هەستی غەریبی و تەنیاییە، لە ناخەوە رۆحی دەکرۆشت. کاتێ سواری پاپۆڕەکەش بوو، لەناو پاپۆڕەکە، لە رێگای گەڕانەوەیاندا بەرەو دورگەکە، گوێی لێ بوو: پەناهەندەکان، هەندێکیان بە ئینگلیزییەکی شکاو، ئەوانی دیکەش بە فارسی و عەرەبی، جنێویان بە خەلّکی دانمارک دەدا... تفیان لە ئاووهەوای دانمارک دەکرد. یەکێک لە پەناهەندە ئێرانییەکان، کە لەوە دەچوو لە هەموویان خوێندەوارتر بێت، بە ئینگلیزی، لەگەلّ پەناهەندەیەکی لبنانی قسەی دەکرد، دەیگوت: ئیبن بەتووتە، لە لاپەڕە دوو صەد و هەشتا و پێنجی گەشتنامەکەی خۆیدا، لەبارەی دانمارکەوە دەلّێ: دانمارک زمانێکی بۆگەن و ئاووهەوایەکی بۆگەن و ئەخلاقێکی بۆگەنی هەیە.

ئەم، یەکجار رقی لەم زەنا زەناو دەمەشڕییەی پەناهەندەکانە،
تەنانەت لە سالۆنی چێشتخانە بچووکەکەی دورگەکەشدا، کاتی
نانخواردن؛ خۆ ساتێک چیە لە شەڕ و هەرا و جنێوی خۆیان ناکەون!
سەیرە! ئەرێ بەڕاست، ئەو ئێوارەیە، لێپرسراوی پەناهەندەکانی ئەم
دورگەیە، خاتوو ئانلی، لەبەرچی گوتی: ناوێکی خۆشت هەیە»؟.
سەیرە! خاتوو ئانلی، هەر لە سەرەتاوە، بە زەردەخەنەیەکی زۆر
خۆشەویستانەوە، لێی هاتە پێشەوە، پرسی:

- تۆ ناوت چیە؟

ئەمیش گوتی: شێرزاد.

خاتوو ئانلی، کونجکۆڵانە لێی پرسییەوە:

- «شێرزاد» لە زمانی کوریدا هیچ واتایەک دەگەیەنێ؟!

ئەمیش گوتی: بەڵێ.

گوتی:

- چی؟

- ئەو کەسەی دڵبڵند و دلێرە.

ئێستاش تێناگەم! ئەم ژنە بۆچی پێی گوت« ناوێکی خۆشت
هەیە؟!». ئایا هەر بۆ ئەوەی رووخۆشیی خۆی لە هەمبەر
«پەناهەندەیەک» پیشان بدا؟ بەڵێ، لەوانەیە، بۆ ئەوەی هەر هیچ نەبێ
بۆ ساتەوەختێک هەوری نیگەرانی و هەستی غەریبایەتیی
بڕەوێنێتەوە.

خاتوو ئانلی، پێش ئەوەی کە ئەو ئێوارەیە ئەم قسانەی لە گەڵ
بکات، یەک دووجاری دیکەش بە نیگایەکی زۆر کونجکۆڵانە سەیری
کردبوو، جارێکیان کاتێ لە قەراغ دەریاکەدا بە تەنیا راوەستابوو،
پشتی بە کۆنە پاپۆڕێکی شکاودا دابوو: مات، مەلوول، بە نیگایەکی
پڕ لە غەریبییەوە تەماشای ئاسۆ دوورە دەستەکانی ئەوبەری دەریای
بەلتیکی دەکرد. لەناکاو خاتوو ئانلی بەتەنیشتیدا تێپەڕی، بە
نیگایەکی پڕ لە پرسیار و سۆز و میهرەبانییەوە تەماشای قەد و باڵای
پڕ لە غەم و تێکشکانی کرد. جاری دووەمیش، لە سەربانی دورگەکەدا
بوو، دیسانەوە، بە تەنیا، پاڵتۆ ئەستوورە رەشەکەی بەسەرشانەوە،



لەسەر تەلاشەبەردێک دانیشتبوو؛ خۆی لە سەرمان وێک هێنابۆوە،
بەدەم بیرکردنەوەوە سنگی دانوشتاندبۆوە و تەماشای مریشکێکی لاواز
و بێ‌هێزی دەکرد کە لە پەنا بەردێکدا، بە دووای کرم و دانەوێڵەدا
دەگەڕا. لەو دەمەدا خاتوو ئانلی، دیسانەوە هات بەتەنیشتیدا
تێپەڕی، بە نیگایەکی خوشکانەی پڕ لە سۆزەوە، زەردەخەنەیەکی
جوانی بۆ کرد. بەڵێ، هەر بۆ ئەمە بوو؛ مرۆڤ لە حاڵەتەکانی تەنیایی
و تێشکشکان و زەبوونیدا، هەمیشە جێگای بەزەیی هاتنەوەیە لە لای
خەڵکی دیکە.

ئاخ! حەیف بۆ شێرزاد! بیست و نۆ ساڵ! بیست و نۆساڵی پڕ لە
ئاسوودەیی و جەربەزەیی وخۆشەویستی، بیست و نۆ ساڵی پڕ لە
خۆشی و دڵبلندی ژیا: بۆ ئەوەی - ئەوەتا- ئەمڕۆ، لەم دوورگە
چەپەکەی دوورە وڵاتیدا، زەبوونانە، دوور لە سەردەمی منداڵیی خۆی،
دوور لە بەهەشتی گەنجێتی خۆی، بە دیار تەنیایی و تێکشکانی
خۆیەوە بگری! حەیف! بە دەم هەناسەیەکی حەسرەتاوییەوە سەری
دانەواندەوە، بەر پەنجەرەکەی بە جێهێشت؛ چوو لەسەر کورسیی بەردەم
مێزەکە، کە لە ناوەڕاستی ژوورکە داندرابوو، دانیشت.

مێزەکە ئاوێنەیەکی چوارگۆشەیی لەسەربوو، هەروەها سێوێک و
پارچە مریشکێکی برژاو. ئەم نیوەڕۆیە، لە سالۆنی چێشتخانەکەدا،
وەک هەموو جەمێکی دیکەی نانخواردنی ناو سالۆنەکە، خۆی لە ناو
هەرای بێزەوەری پەناهەندەکاندا پێڕانەگیرا: پەناهەندەیەکی لبنانی،
لەسەر مێزی نانخواردن، لەگەڵ پەناهەندەیەکی سریلانکی بووە
شەڕیان؛ ئیتر کەوتنە گیانی یەکتر، بووە هەرا؛ ئەو هەر چۆنێک بێت
توانی زەلاتەکە بە نابەدڵییەوە تەواو بکات، بەڵام پارچە مریشکە
برژاوەکەی، لەگەڵ سێوەکە، لەناو نایلۆنێک وەرپێچا و هەڵسا، لەگەڵ
دەستی خۆی هێنانیە ژوورەوە و لە سەر ئەم مێزەدا دایانا.

دانیشتبوو، بێدەنگ، تەماشای پارچە مریشک و سێوەکەی بەردەم
خۆی دەکرد. لەناکاو زەردەخەنەیەک گرتی.

ئەوسات منداڵ بوو! باش بە بیری دێ، هەموو جارێک، کاتێ لەگەڵ
دایکی بەناو رەزەکەی خۆیاندا تێپەڕ دەبوون؛ چەتوونانە، بەدەم

رێگاوە، شەقی لە سێوە کەوتووکانی بەرپێی خۆی هەڵدەدا، دایکیشی
بە نەرمییەوە، خۆی لێ توورە دەکرد، دەیگوت:

– کورم شێزاد؛ گوناحە... ئاوها شەق لەو سێوانە هەڵمەدە!

ئێستاش ئەوەتا، ئەمڕۆ دووای ئەو هەموو ساڵە، لە دورگەیەکی
لاتەریک و بەستەڵەکدا، ژەمی هەموو نیوەڕۆیەکی، هەمیشە پارچە
مریشکێک و تەنیا تاقە سێوێکە! تاقە سێوێک!

هەر دوو ئانیشکی چەقاندبووە سەر مێزەکە. چنگەکانی، لەملاو
لەولا، لە کاژەڵاکی خۆی گیرکردبوو. کە بیری دەکردەوە، قوڵپی
گریانێک لە ناخیدا پەنگی دەخواردەوە. سەری هەڵبری، لە ئاوێنە
بچکۆڵەکەی سەر مێزەکەدا تەماشای خۆی کرد: سەروقژێکی بژ،
تۆپەڵێ ریش، دوو برۆی ئەستووری ماندووی بە یەکداچوو...
چاوەکانیشی، سەیرە؛ ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر بە قووڵدا دەچن!

زۆر سەیرە! ئەمڕۆ ئێوارە، لە بەردەم ئەم ئاوێنەیەدا بەم سەروپۆتەڵاکە
شێواوەی خۆیەوە، بەم ڕۆحە پەژموردەیەی خۆیەوە، هەر بەتەواوەتی لەو
شێرە سوگوارە تێکشکاوە دەچێ، کە نۆزدە ساڵ پێش ئەمڕۆ لە
گوندەکەی خۆیاندا بینیبووی! ئێستا وەک خەونێک دێتەوە بیری!
ئێوارەیەک، لەماڵەوە، لە گەڵ دایک و مامۆژن وخوشک و براکانی، لە
نێزیک ئاگرداندا خەریکی نانخواردن بوو؛ لە ناکاو شێرێک « کە
پەتێکی درێژی لە دوو دەخشا» بە بێهێزییەوە وەژوور حەوشەی
ماڵەکەیان کەوت و چوو بێدەنگ لە هەیوانەکەیاندا وەرکەوت.

خوشکە بچکۆلانەکەی، کاتێ چاوی بە شێرەکە کەوت، هەترەشی
چوو؛ چاوی ئەبڵەق ما، پەنجەی بۆ دەرەوە درێژ کرد و لە قیژەی دا:
«شێر».

ئەمە یەکەمین جار بوو لە ژیانیدا کە شتی ئاوها سەیر ببینێ: لە
ئێوارەیەکی دەرەنگ وەختدا، شێرێک لەناکاو وەژوور ماڵەکەیان
بکەوێت و بچێ بێدەنگ لە هەیوانەکەیاندا وەرکەوێ! ئەم ماوەیەش
باوکی، ساڵانێکی زۆربوو بە سەفەرێکی درێژ ڕۆیشتبوو، نەگەڕابۆوە.

دایکی، کاتێ چاوی بە شێرەکە کەوت، یەکسەر، بەرزە پێ،
هەڵسایەوە؛ چوو پەلاماری مشتووی دەرگاکەی دا؛ لە دیوی ژوورەوەڕا



یەکسەلەف دەرگاکەی کلۆم دا. ئنجا هەموویان پێکەوە، بەلەز،
رایانکردە بەر پەنجەرەکە. خۆی و دایک و مامۆژن وخوشک و برا
بچکۆڵەکانی، بەسەر شان و ملی یەکترەوە، وەک تۆپەڵێک پرسیار و
ترس و سەرسوڕمان، هەوڵیان دەدا تەماشای شێرەکە بکەن.
شێرەکەش، ماندوو، رەتاو، بەدەم هێنکە هێنکەوە، لە پەنا دیواری
دالانەکەدا وەرکەوتبوو. لەژێر تیشکی مانگەشەودا قوڕاوێکی پیسی
لیخن بە تیسکەکانییەوە دەبریسکایەوە. چەند پەڵە خوێنێک بە
نێوچەوان و لاجانگییەوە هاتبوونە خوارەوە؛ کاژەڵاک و
پەناگوێکانیشی تنۆک، تنۆک، زووخاوێکی لینجیان لێ دادەچۆڕا.

سەیرە! ئەو شێرە لەوە دچوو لە رێگایەکی زۆر دوورەوە هاتبێت و ئەم
دالانەی بە پەناگەیەکی ئارام زانیبێت، بۆ ئەوەی کەمێک بحەسێتەوە.
لەوانەشە ڕاویان نابێت، جار بە جار سەروگوێلاکی خوێناویی خۆی
رادەوەشاند، بە بە بێهێزییەوە دەست و پەلی خۆی رادەوەشاند بۆ ئەوەی
پەتە درێژەکە لە ملی خۆی بکاتەوە... بەڵام نەیدەتوانی.

ئاخ ! ئێستا ئەمیش، شێرزاد، ئەوەتا لێرە، لەم دورگەیەدا، خۆی
وەک ئەو شێرە رۆژگاری منداڵیی خۆی دێتە پێش چاو! حەیف! بە
درێژایی هەموو ژیانی، هەرگیز خۆی هێندە زەبوون و تەنیا و تێکشکاو
نەبینیوە! مامۆژنەکەی، بە بیری دێ، خۆی بەسەر پەنجەرەکەدا شۆڕ
کردبۆوە، تەماشای شێرەکەی دەکرد، دەیگوت:

– ئەم شێرە، هەبێ ونەبێ لە شەڕێکدا تێکشکاوە!

دایکیشی، بە میهرەبانییەوە دەلالایەوە، دەیگوت:

– لە چاوان کوێر بم، شێر کەینێ ئەوەندە مات و بێ دەست بوونە!
من قەت شێرم ئاوها کز و زەبوون نەدیون!

برا بچکۆڵەکەیشی، بە هەڵپە لە دایکی دەپرسی:

– ئەو پەتە درێژە چیە لە ملی کراوە ؟

خوشکە بچکۆڵەکەشی، کە هێشتا ترسی نەڕەوابۆوە، دەیگوت:

– نا دایە... لە حەپسخانە غاری داوە.

نزیکەی نیو سەعات هەر لە بەر پەنجەرەکە راوەستابوون و بە دەم
قسەوە سەیری شێرەکەیان دەکرد. شێرەکەش لە هەیوانەکەدا، لە هەمان

شوێنی خۆی وەرکەوتبوو، هیچ جوڵەیەکی نەدەکرد؛ تەنانەت بە هیچ
شێوەیەک جورئەتی ئەوەیشی نەدەکرد کە جارێک بتوانێ سەری خۆی
بەرز بکاتەوە و تەماشای دەوروبەری خۆی بکات. تەنیا ئەوەندە نەبێ
کە جار بە جار، بێهێز، دەستی بۆ سەروگوێلاکی خۆی دەبرد، مێش
ومەگەزی لە برینە خوێناوییەکەی لاجانگی خۆی دەردەدکرد و
نەیدەتوانی؛ « مێش و مەگەز تێیی وەرهاتبوون و لە دەوری سەری
گیزەگیزیان بوو» جارجار کەلەکی خۆی دەگۆڕی و بە دەم نرکەیەکی
بریندارەوە وەردەکەوتەوە.

لە کۆتاییدا، دایکی، چیتر خۆی لە بەردەم ئەم دیمەنە پێ ڕانەگیرا؛
بەرزە پێ هەڵسایەوە، گوتی:

– دەچم گۆشتی دەدەمێ،

مامۆژنی کردیە گاڵە، ڕازی نەبوو. خوشک و برا بچکۆڵەکانیشی بە
هەمان شێوە، لە دەوری دایکیان کۆبوونەوە، دامێنیان گرت، گوتیان:
«نا، مەچۆ؛ دەتخوا».

دایکی گوتی: «نا». چوو پارچە مریشکێکی برژاوی بەرماوەی
جەمی ئێوارەی خۆیانی، لەگەڵ سێوێک، لەناو پارچە نایلۆنێک لوول
دا. دەرگاکەی کردەوە، گوتی: «دەچم لەبەری دادەنێم».

خوشک و برا بچکۆڵەکانی، مامۆژنی، هەموویان پێکەوە، بێدەنگ،
چاویان ئەبڵەق مابوو؛ لە پەنجەرەوە تەماشای دایکیان دەکرد کە
خەریک بوو هێدی هێدی، بە هەنگاوی کەمێک سلۆکانەوە، لە شێرەکە
نزیک دەکەوتەوە. شێرەکەش هیچ جووڵەیەکی نەدەکرد، خامۆش، لە
پەنا دیواری هەیوانەکەدا وەرکەتبوو.

لەو دەمەدا بێدەنگییەکی سامناک، کە لە ترس و نائارمی و
حەپەسانەوە هاتبوو، باڵی بەسەر هەموویاندا ڕاکێشابوو؛ لە
پەنجەرەکەوە سەرنجیان دەدا: دایک لەبەردەم شێرەکەدا ڕاوەستا بوو،
پارچە مریشک و سێوەکەی (لە ناو نایلۆنەکەدا) بە دەستەوە گرتبوو،
پاشان، لەسەرەخۆ، نوشتایەوە، پارچە مریشک و سێوەکەی دانایە
بەردەم شێرەکە.

ئەوان وەک بڵێی هێشتا باوەڕیان بە چاوی خۆیان نەدەکرد،



حەپەساو، دەمیان داپچڕیبوو، بە نائارامییەوە چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد
کە دایک، زوو، بە سەلامەتییەوە بگەڕێتەوە لای خۆیان: بۆ ئەوەی
ئیتر لەو کاتەدا، هەموویان پێکەوە لە کەیفخۆشیان بە دەنگی بەرز
بکەنە هەرا و پێکەنین.

لە ناکاو، پێکەنین و غەڵبەغەڵبێکی سەیر لە پەنجەرەکەوە بەرز
بۆوە، ڕاچڵەکی، وەک ئەوەی خەیاڵی لە جیهانێکی دیکەدا بووبێت و
تازە هاتبێتەوە هۆش خۆی؛ بە ماندوویی و بێهێزییەوە سەری بەرز
کردەوە، تەماشای پارچە مریشک و سێوەکەی بەردەم خۆی کرد،
هەستی بە نیگەرانی و زەبوونییەکی کوشندە دەکرد: لە حەژمەتان
خەریک بوو دڵی شەقی دەبرد.

**دورگەی «میدل گراند» – ١٩٨٥**

# کوژرانی عەسکەرێکی تورک لە زاخۆ



«گێڕانەوەی ڕووداوەکە بە زمانی ئەفەندی»

**- من و ژنەکەم و دوو منداڵەکەم بووین، لەسەر پردەکە دەڕۆیشتین. سێ عەسکەری تورک بەرامبەرمان دەهاتن. من دەستی کچەکەی خۆم گرتبوو. دەمانویست لە پردەکە بپەڕینەوەو بچین سەرێک لە پەیکەری (ئەحمەدی خانی) بدەین. ژنەکەم، کوڕ بە باوەشەوە، چەند مەترێک لە پێش منەوە دەڕۆیشت. لەناکاو، یەکێک لە عەسکەرە تورکەکان، دەستی درێژ کرد؛ بە بەرچاوی خۆمەوە، قوونی ژنەکەمی گرت.**

«گێڕانەوەی ڕووداوەکە بە زمانی شایەدێک»

**- گەورەم، من تەنیا لەوکاتەوە ئاگاداری ڕووداوەکەم کە لەناکاو، لە پشت منەوە، دەنگی ڕێژنە گوللەیەکی کلاشنکۆف بەرزبۆوە، صەڵیەیەک بوو. ڕاستیەکەی، نازانم کێ لە کێی دا! بەڵام بەچاوی خۆم بینیم: (ئەو عەسکەرە نەبێ کە لەناو خوێندا دەگەوزی) هەردوو عەسکەرەکەی دیکە سەرخۆش بوون؛ دیاربوو زۆریان خواردبۆوە.**

«گێڕانەوەی ڕووداوەکە بە زمانی (تاوانبار)»

- من ئاگاداری سەرتاپای ڕووداوەکە بووم، لە سەرەتاوە تا ئەمڕۆ، چونکە من لەسەر شۆستەی ئەوبەری پردەکەوە چاوم لە هەموویان بوو: ئەفەندی، خۆی و ژنەکەی و دوو منداڵەکەی بوون. دیاربوو غەریبەن و بۆ سیاحەت هاتوونەتە زاخۆ. ئەفەندییەکە دەستی کچەکەی خۆی گرتبوو، ژنەکەش کوڕە بچکۆڵەکەی لە باوەش گرتبوو؛ چەند مەترێک لە پێش مێردەکەی خۆیەوە دەڕۆیشت. لەناکاو، عەسکەرە تورکەکە دەستی درێژ کرد و قوونی ژنەکەی گرت.

«گێڕانەوەی ڕووداوەکە بە زمانی یەکێک لە عەسکەرە تورکەکان»

**- مەرحووم، نەخێر، هیچ هەڵەیەکی بەرامبەر هیچ کامێکیان نەکرد، بەڵکو بەپێچەوانەوە، لەسەر پردەکە، چوو، زۆر موحتەرەمانە، بۆ خۆشەویستی و موجامەلە، قوتووە پیپسییەکی پێشکەش بە ئەفەندیی مێردی ژنەکە کرد. ئیدی، کارەسات و تاوانەکە لێرەوە دەستی پێکرد.**

«گێڕانەوەی ڕووداوەکە بە زمانی ئەفەندی»

**– بەڵێ، ڕاستە، جەنابی حاکم، من دووای ئەوە، تفێکم لە عەسکەرەکە کرد. کە تفم لێی کرد، یەکسەر کڵاشنکۆفەکەی لە شانی هێنایە خوارەوەو ویستی بمکوژێ. بەدەم هێنانە خوارەوەی کڵاشنکۆفەکە لەسەر شانی و خۆ ئامادەکردنی، چەند مەترێک لە منی منداڵ بە شانەوە دوورکەوتەوە. لەم کاتەدا بوو، ئیتر، پێش ئەوەی ئەو تەقە لە من بکات، عەسکەرە هاوڕێکەی خۆی، لە تەنیشت خۆیەوە، صەلیەیەک کڵاشنکۆفی پێوە نا و... پاشان ڕایکرد.**

«گێڕانەوەی ڕووداوەکە بە زمانی شایەدێک»

**- گەورەم، وەکو گوتم: ناتوانم بڵێم «ئەو پیاوەی لەسەر شۆستەکەوە هاتبوو صەڵیە کڵاشنکۆفەکەی لە عەسکەرەکە دا». من ئەمەم نەبینی، بەڵام کە گەیشتمە سەر ڕووداوەکە، کڵاشنکۆفەکە لەدەست ئەو عەسکەرە بوو کە پاشان ڕایکرد و ئێستا لێرە نییە.**

«گێڕانەوەی ڕووداوەکە بە زمانی (تاوانبار)»

– من لەوبەری شۆستەی سەر پردەکەوە، کاتێ عەسکەرەکەم بینی کڵاشنکۆفی لە ئەفەندی ڕاکێشا، بە پەلەپەل ڕامکردە لایان بۆ ئەوەی ناوبژییان بکەم و ئەو ئەفەندییە بە خۆی و منداڵەکەی باوەشییەوە نەکوژرێت. پێش ئەوەی بگەمە لای عەسکەرەکە، صەلیەیەک کڵاشنکۆف لە تەنیشتییەوە بەرزبۆوەو خەڵتانی ناو خوێنی کرد، عەسکەرەکەی هاوڕێی خۆی بوو، کوشتی. کوشتی و پاشان ڕایکرد.

«گێڕانەوەی ڕووداوەکە بە زمانی یەکێک لە عەسکەرە تورکەکان»

**– مەرحووم کاتێ قوتووە پیپسییەکەی پێشکەش بە ئەفەندی کرد، گوێم لێ بوو ئەفەندی زۆر بە تووڕەییەوە، بە تورکی گوتی: «یۆخ، ئیچمەرەم». هاوڕێکەم گوتی: «ئیچ». ئەفەندی، هەر بە تورکی و تووڕەییەوە گوتی: «من بێز لە پیپسیی تورکی دەکەمەوە. ئابڵووقەم لەسەر هەموو کەلوپەل و خواردن و خواردەمەنییەکی تورکی داناوە. هەرگیز شتی تورکی ناکڕم و ناخۆم و ناخۆمەوە». هاوڕێکەم گوتی: «بۆ؟». ئەفەندی گوتی: «چونکە ئێوە پیس و داگیرکەرن». هاوڕێکەم گوتی: «ببوورە». کە کەمێک لە یەکتریش دوورکەوتینەوە، ئەفەندی – بۆ جاڕسکردنی ئێمە– هاواری کرد: «بژی کوردستان».**



«گێڕانەوەی ڕووداوەکە بە زمانی ئەفەندی»

**– چۆن؟! بەڵێ جەنابی حاکم، من دووای ئەوە تفێکم لە عەسکەرەکە کرد. ئا، بەڵێ، هەردوو دەستم گیرابوو: منداڵەکەم بە باوەشمەوە بوو.**

«گێڕانەوەی ڕووداوەکە بە زمانی شایەدێک»

**- بەڵێ؟ نەخێر جەنابی حاکم، من ئاگام لەوە نییە ئەگەر عەسکەرە کوژراوەکە قوونی ژنەکەی گرتبێت. بمبوورە، چیتان فەرموو؟ ئەو عەسکەرەی ڕایکرد؟ نازانم. نازانم بۆچی ڕایکرد، بەڵام سەرخۆش بوو. لەوانەیە لە ترسان ڕایکرد بێت.**

«گێڕانەوەی ڕووداوەکە بە زمانی (تاوانبار)»

– چۆن جەنابی حاکم؟ بەڵێ، من بە چاوی خۆم دیتم: عەسکەرەکە قوونی ژنەکەی گرت. عەسکەرەکەی دیکەش، بەپێچەوانەوە، هێندە شەرەفمەند و پیاو بوو کە غیرەتی قبووڵی نەکرد لەبەرچاوی ئەمەوە قوونی ژنێک بگرن و پاشان مێردەکەشی بکوژن. سەرخۆشیش بوو. پاشان، جەنابی حاکم، هیچ دوور نییە صەڵیەی کڵاشنکۆفەکەی ئاراستەی ئەفەندی کردبێت و بەر هاوڕێکەی خۆی کەوتبێت! چوزانم. سەرخۆش بوون، ئیتر.

«گێڕانەوەی ڕووداوەکە بە زمانی یەکێک لە عەسکەرە تورکەکان»

**– مەرحووم بەدەستی هاوڕێکەی خۆی نەکوژرا. هەردوو تاوانبار درۆ دەکەن و پێکەوە لەسەر ئەوە ڕێک کەوتوون کە ئەم سیناریۆیە هەڵبەستن و بیلێینەوە. ڕاستە، مەرحووم بەمە زۆر سەغڵەت بوو کە ئەفەندی جنێوی بە تورکان دا و پاشان هاواری کرد «بژی کوردستان»، بەڵام هیچ وەڵامی ئەوی نەدایەوە. تاوانبار، واتە ئەو پیاوەی کە لەوبەری شۆستەکەوە هاتە لامان، ئاگرەکەی خۆشتر کرد و کەوتە جنێودانی ئێمە؛ خۆی وا نیشان دەدا کە ئێمە تەعەدامان لە ژن و مێردەکە کردووە و ئەو لەسەریان دەکاتەوە. هەر خۆیشی، پاشان، لەناکاو، کڵاشنکۆفی لە شانی هاوڕێکەم کردەوە و کوشتی.**

«گێڕانەوەی رووداوەکە بە زمانی ئەفەندی»

**– من بۆ خوا دەیڵێم: ئەو پیاوەی لەوبەر شۆستەکەوە هاتە ناومانەوە، خوا دەست بەباڵییەوە بگرێت، پیاوێکی خێرۆمەند بوو. راستە: لەسەر ئێمە بە جواب هات و پێی ناخۆش بوو عەسکەری تورک بە نوێژی نیوەڕۆ تەعەدا لە ئێمە بکەن، بەڵام ئەویش، هەروەک من؛ لەناکاو بە دەنگی صەڵیەی کلاشنکۆفەکە راچەنی. هەرگیز چاوەڕێی ئەوەمان نەدەکرد کە ئەو عەسکەرەی دیکەی هاوڕێی، لەسەر ئێمەی بێ چەک و تەعەدا لێکراو بکاتەوە!**

«گێڕانەوەی رووداوەکە بە زمانی شایەدێک»

**- گەورەم، لەبارەی «ئەو پیاوەی کە لەسەر شۆستەی ئەوبەری پردەکەوە هاتبووە لایان»، من تەنیا ئەوەندەم لەبیرە: لە دووای صەڵیەکە و کوژرانی عەسکەرەکە، لەسەر مەیتەکە راوەستابوو و بە ئەفەندییەکەی دەگوت «باش بوو هەر بەدەستی خۆیان کوژرا». لەم کاتەدا، دەمدیت: عەسکەری راکردوو، لەدوور، پشتی لە ئێمە، هەر غاری دەدا و سەرخۆشانە دەلەنگایەوە.**

«گێڕانەوەی رووداوەکە بە زمانی (تاوانبار)»

– جەنابی حاکم، من دانی پێدا دەنێم: ویژدان و کەرامەتم قبووڵی نەکرد کە عەسکەری تورک لە پێش چاوی من، بەم شێوەیە، تەعەدا لە ژنێکی کورد بکەن و پاشان بیانەوێ مێردەکەش بکوژن؛ بە راکردن پەڕیمەوە لایان؛ بەڵام من تەنیا بۆ ئەوە چووم کە بەرەوانییان بکەم و نەهێڵم ئەفەندی بکوژرێت. هەرگیز دەستم نەدایە چەک.

«گێڕانەوەی رووداوەکە بە زمانی یەکێک لە عەسکەرە تورکەکان»

**– جەنابی حاکم، پێش هەموو شتێک، دەمەوێ ئەوەتان عەرز بکەم کە ئێمە، شتاقمان، سەرخۆش نەبووین. پاشان ئێمەی تورک، بام سەرخۆشیش بین، هەرگیز هێندە کەم نین بچین قوونی ژنان بگرین. جەنابی حاکم، ئەگەر مەسەلەکە رق و کینەیەکی سیاسی نەبێت، چۆن پیاو لەسەر «قوونی ژنێک» دەست دەداتە کلاشنکۆف و عەسکەری دەوڵەت بکوژێت؟! ئەم دوو پیاوە، هەردووکیان، رقیان لە تورک و عەسکەری تورکە سیناریۆکەیان دیارە لەسەر درۆ هەڵبەستراوە، دەیانەوێ بەرگری لە هەڵە و تاوانی یەکتر بکەن.**



«گێڕانەوەی رووداوەکە بە زمانی ئەفەندی»

**– جەنابی حاکم، جەنابت من بەوە تاوانبار دەکەیت کە سەرەتای هەرایەکە من دروستم کردووەو چوویمە تفم لە عەسکەرە تورکەکە کردووە. من تەنیا یەک پرسیارتان لێدەکەم، جەنابی حاکم: «تۆ، بە خۆت و ژنەکەت و دوو منداڵتەوە، ئەگەر لە هەولێرەوە بۆ پیاسە هاتبنە زاخۆ و لەناکاو، لەسەر پردێک، عەسکەرێکی تورک، بە بەرچاوی خۆتەوە قوونی ژنەکەت بگرێ؛ چ دەکەی؟».**

«گێڕانەوەی رووداوەکە بە زمانی شایەدێک»

**- گەورەم، من ناتوانم وەڵامی ئەم پرسیارەتان بدەمەوە: چونکە من ئاگام لە هیچ نییە، تەنیا ئەوەندەم دیوە و بیستووە کە باسم کرد. نەخێر، ئاگام لە مەسەلەی پێشکەشکردنی قوتووە پیپسییەکە نییە. هیچ قوتووی پیپسیشم لە شوێنی تاوانەکەدا نەدیت. خۆ ئێوە ئیفادەی ژنەکەشتان وەرگرتووە، جەنابی حاکم.**

«گێڕانەوەی رووداوەکە بە زمانی (تاوانبار)»

– وەڵڵا بابە باش، لە وڵاتی خۆماندا تەعەدامان لێ بکەن و پاشانیش خۆمان تاوانبار بکەن و بە پیاوکوژ لە قەڵەممان بدەن! جەنابی حاکم، بمبوورە، رێگەم بدەنێ پرسیارێک لە جەنابتان بکەم: ئەگەر قاتل خودی عەسکەرەکەی هاوڕێی خۆی نەبێت، بۆچی رایکرد و تا ئێستاش خۆی ون کردووە؟ ئێوە چۆن دەکرێ دادگایی من و ئەفەندی بکەن لە حاڵەتێکدا لایەنێکی تاوانەکە (هەر تاوانبارەکە خۆی) لێرە نیە؟

«گێڕانەوەی رووداوەکە بە زمانی یەکێک لە عەسکەرە تورکەکان»

**– هاوڕێکەی ترمان (ئەوەی غاری دا)، هەقی بوو غار بدا: چونکە بە بەرچاوی خۆیەوە یەک صەڵیە کلاشنکۆفیان لەم بەستەزمانە دا. ئیدی، ئەویش، لەوانەیە ترسابێت، رایکرد. پێویستیش ناکا بێتە دادگا، مەگەر تەنیا وەکو شایەتێک، چونکە ئەو هیچ پەیوەندییەکی بەم سیناریۆ هەڵبەستراوە نییە کە ئەمانە دروستیان کردووە.**

«گێڕانەوەی ڕووداوەکە بە زمانی ئەفەندی»

**– جەنابی حاکم، جەنابت من هەر بەوە تاوانبار دەکەیت کە چوومە تفم لەو عەسکەرە کردووە. من، دیسان، ڕێگەم بدە، تەنیا یەک پرسیارتان لێدەکەم:**

**«جەنابت، بە خۆت و ژنەکەت و دوو منداڵتەوە، ئەگەر لە هەولێرەوە بۆ پیاسە هاتبنە زاخۆ و لەناکاو، لەسەر پردێک، عەسکەرێکی تورک، بە بەرچاوی خۆتەوە قوونی ژنەکەت بگرێ؛ تۆ چ دەکەی؟ ها؟!**

# بیابان



خوشکە چکۆڵەکەی «حاشووش» لەناکاو خۆی کوتایە ژوورەوە، بە پەلەپرووزێ و هەناسە بڕکێوە وتی:

– دایە، دایە.. سبەینێ دیسان ماڵە کوردەکان ڕادەگوێزنەوە.

لەو دەمەدا من و حاشووش بەرامبەر یەکتر دەانیشتبووین، دامەمان دەکرد. حاشووش کە گوێی لە هەواڵەکە بوو، یەکسەر، دەستی لە بەردی دامەکە ساردبۆوە، تەمی خەفەتێکی لەناکاو کەوتە سەر رووی. دایکیشی، بەدیار سەماوەرەکە مات ما؛ بە غەمگینی و بە چاوێکی پڕ بەزەییەوە نیگایەکی کردم. من کە ئەو وەختە منداڵ بووم و زمانی عەرەبیم باش نەدەزانی، لە سەرەتادا لەو عەرەبییە جلفییەی خوشکەکەی «حاشووش» حاڵی نەبووم، بەتایبەتیش لەبەرئەوەی زۆر بە هەشتاوی هەواڵەکەی پێمان راگەیاند.

باوکی حاشووش، کە دیار بوو ئەویش، ئەم هەواڵەی زۆر لەسەر دڵ گران دەهات، رووی کردە کچەکەی:

– کێ وای پێ وتی؟

کچۆڵەکە، بە شڵەژاوییەوە سەیرێکی منی کرد؛ ئنجا رووی کردەوە باوکی:

– ماڵی سەعدیەی دراوسێمان.

– وتیان چی؟

– ئەبوو سەعدیە وتی.

– وتی چی؟

– وتی: «سبەینێ ماڵە کوردەکان رادەگوێزنەوە».

دایکی حاشووش بە خەفەتبارییەکی پڕ لە گازاندەوە، وەک ئەوەی بە نهێنی قسە بکا، رووی کردە باوکی حاشووش:

– راست دەکا. «ئەبو سەعدیە» پۆلیسە؛ دەزانێ.

باوکی حاشووش لەبەرخۆیەوە گوتی:

– ئاخر؛ لە شیمالەوە بۆ جنووب، لە جنووبەوە بەرەو کوێ؟ سەیرە! من یەکسەر تێگەیشتم؛ زانیم کە ئیدی ئەمجارەیان بە یەکجارەکی رامانده‌گوێزنەوە بەرەو ئێران، یانیش بەرەو بیابانەکانی سەر سنووری «ئوردن». خەریک بوو لە پرمەی گریان بدەم. زۆر لەمێژ بوو باوکم

باسی ئەمەی بۆ دەکردین. چیتر خۆم پێ نەگیرا؛ بەدیار فایبەری
دامەکەوە، سەرم نوشتاندەوە سەر سنگم، وەک منداڵێکی لە تەمەنی
ئەوسام زۆر بچووکتر، لە حەژمەت دەردەسەری و سوگواریی خۆماندا
دەستم کردە گریان: من نەمدەزانی بۆچی و تا کەی نەفی کرابووینە ئەم
بیابانە گەرمەسێرەی باشووری عیراق.

بۆ بەیانییەکەی، کاتێ لە ژووره زیندان ئاسا تاریکەکەدا، دیمەنی
شەوی دوێنێ و چۆنیەتی راگەیاندنی هەواڵەکە و پەشۆکانی ماڵی
حاشووشم بیر دەهاتەوە؛ دڵم زیاتر تەنگ دەبوو. لەسەر تەنەکەیەکی
قوپاوی ژەنگاوی دانیشتبووم، هەنسکم دەدا و لەبەر خۆمەوە هۆن هۆن
دەگریام. لە دڵی خۆمدا دەمگوت:
– خەتای خۆم بوو. بۆچی شەو لە ماڵی حاشووش مامەوە؟
یازدە مانگی رەبەق بوو (من و دایک و باوک و خوشکێکی
بچکۆلانەم) لەو بیابانەی باشووری عێراقدا دەژیاین. چل پەنجا
ماڵێک دەبووین لەوێ. بیابانی رِوممادی ! بیابانێکی هەتا چاو بڕ دەکا
چۆڵەوانی و وشکایی بوو!
من، کە بە درێژایی ئەو نۆ ساڵەی رابردووی منداڵیم، هەمیشە لە
کوێستان و لەناو شاخ و باخی رەنگیندا دەژیام؛ ژیان و گوزەرانی ئەو
بیابانەم زۆر لەسەر دڵ گران دەهات. هەموو سپێدەیەک، کە لە خەو
هەڵدەستامەوە، لەجیاتی فێنکایی شنەبا و شەونمی ناو باغ: هەستم بە
گەرد و گەرمای سووتێن دەکرد؛ لەجیاتی ئەوەی سەمۆرە و قاز و
کارژۆڵەکانم لە نزارە سەوزەکەی بەرانبەر ماڵمان ببینم: غوبارێکی
زەرد، توێژێک تۆزی سووتاوی پێمدا دەپژاند. بۆ دایک و باوک و
خوشکەکەیشم، هەمان سەغڵەتی و بەدبەختی بوو. بەدرێژایی هەموو
ئەو یازدە مانگەی لەو بیابانەدا بووین، تەنیا ماڵی حاشووش و ماڵە
عەرەبێکی دیکە هاموشۆیان دەکردین و جاربەجار یارمەتییان دەداین.
باوکم بۆ ئەوەی بتوانێ بەخێومان بکات، هەر سێ چوار رۆژ
جارێک، بەگەڵ باوکی حاشووش دەکەوت؛ دەچوون، نازانم لە کام
گوندی نزیک ئاواییەکە، تووریان دەکرِی و دەهاتنەوە لە ئاواییەکە



دەیانفرۆشتەوە.
منیش، هەموو بەیانییەک، لەگەڵ حاشووش، دەچووین لە
زەلکاوێکی پیسی دوورەدەستی ئاواییەکەدا، کە هەمیشە پڕ بوو لە
مێش و مەگەز، ماسیی جۆرِوەمان دەگرت ، دەهاتینەوە و لە
ئاواییەکەدا دەمانفرۆشتنەوە. ئێوارانیش، لەگەڵ حاشووش و منداڵە
عەرەبەکانی دیکەی ئاوایی، دەچووین لە نزیک ماڵی حاشووش، لە
چۆڵەوانییەکی وشک و برینگدا، کە تەنیا چەند بڕکە خورمایەکی لێ
بوو و شەوان حوشترەکانیان لەژێر دەبەستنەوە؛ یاریی فوتبۆڵێنمان
دەکرد.

من زۆر حەزم لە فوتبۆڵێن دەکرد. هەمیشە نەخشەیەکی یاریکردنی
فوتبۆڵێنم لە باخەڵ بوو. ناوی هەموو منداڵە یاریکەرەکانم لەسەر
نووسیبوو؛ شوێن و رۆڵی هەر یەکێکیانم بە هێما و هێڵی
جۆراوجۆرەوە، لەسەر تیکەی کاغەزێک دەسنیشان کردبوو: «هجوم»،
«دیفاع»، «هەدەف». گەلێک ئێواران، کاتێ لە فوتبۆڵێن شەکەت
دەبووین و شەو باڵی تاریکی خۆی بەسەر بیابانەکەدا رادەکێشا، ئیتر
لەگەڵ حاشووش بەیەکەوە دەچووینەوە ماڵی حاشووش. گەلێک
شەوانیش هەر لە ماڵی ئەوان دەمامەوە و دەخەوتم.

دایکم پێی خۆش بوو کە من لەگەڵ منداڵە عەرەبەکانی ئەوێ یاریی
فوتبۆڵێن دەکەم. دەیگوت:
– بەڵکو لەگەڵ منداڵە عارەبەکان فێری عارەبی دەبێ.
بەڵام باوکم، جارێکیان – بەم دواییە – خۆی لێ توورِە کردم، وتی:
– بەناخێری گیانت کە لە فوتبۆڵێن تەواو دەبی، شەوان بۆ خەوتن
وەرەوە کاولبووەکەی خۆت؛ مەچۆرە ماڵە عارەبان!
– بابە، ئاخر، کە تاریک دادێ، دەترسێم بەو بیابانەدا بگەرِێمەوە
ماڵەوە.
– چاوت دەردەهات. دە کەواتە واز لە فوتبۆڵێن بێنە!
«باوکم راستی دەکرد! ئەگەر ئەو ئێوارەیە، لە دووای فوتبۆڵێن

بگەڕامایەوە ماڵی خۆمان و شەو لە ماڵی حاشووش نەنووستمایە، ئیتر
لە دایک و باوکم دانەدەبڕام؛ تووشی ئەم چورتمە و ئەم بەدبەختـییەی
ئێستا نەدەهاتم! خەتای خۆم بوو. ئا». لە ژووره شێدار و تاریکەکەدا،
دڵم خەریک بوو شەقی دەبرد. لە درزێکی دەرگاکەوە تەماشای دەرەوەم
دەکرد، بیرم لە دایکم دەکردەوە، لە خوشکە بچکۆڵە خنجیلانەکەم.
دەترسام لەم ماوەیەی ئێستادا، کە من لەم ژووره زیندان ئاسایەدا
راگیراوم، ماڵەوەمان سواری زیلی عەسکەری بکەن و رایانپێچن بەرەو
ئێران یان بەرەو سنوورەکانی ئوردن؛ ئیدی جارێکی دیکە، هەرگیزاو
هەرگیز نەیانبینمەوە!

ئەو ژووره زیندان ئاسایەی کە منیان تێدا راگرتبوو؛ سەیتەرەیەکی
پۆلیس بوو، پارێزگاری ئەو ناوچەیەی بیابانەکەی دەکرد. تەنیا نیو
سەعاتێک لە ماڵی خۆمانەوە دوور بوو. ژوورێکی فراوانی شەش
پاڵوویی بوو: تاریک، شێدار، گەرم، بۆنی میز و باینجانی لێدەهات؛
دیوارەکانی بە بلۆک و بەرد «هەندێ شوێنیشی بە تەنەکە و بەرمیل»
دروستکرابوون. ئەو بەیانییە، خۆر تازە خەریک بوو گزنگی دەدا. من
زوو ماڵی حاشووشم بەجێ هێشت. بەناخێری گیانم، وتم «با رێگاکە
قەدبڕ ببڕم و بەلای سەیتەرەکەدا بگەڕێمەوە»، کەچی کە گەیشتمە لای
سەیتەرەکە، پۆلیسە عارەبەکە لەوبەرەوە، هەر کە چاوی بە من کەوت
«وەک ئەوەی بە درێژایی هەموو ژیانی، هەرگیز لەو بیابانەدا هیچ
بەیانییەک چاوی بە بەشەر نەکەوتبێ» تفەنگەکەی سوار کرد و لە
دوورەوە لوولەی تفەنگەکەی ئاراستە کردم؛ هاواری کرد:
«ئۆگەف!».

«ئاخر چیم کردووە؟»، «سەیرە!»، «وا دوو سەعات زیاترە»؛ «بۆچی
منیان لەم ژوورەدا راگرتووە؟!، تاوانم چییە؟». لەوە زیاتر خۆم پێ
رانەگیرا، دەرگاکەم لادا و چوومە دەرەوە؛ کە گەیشتمە بەر دەرگاکە،
پۆلیسەکە یەکسەر تفەنگەکەی لە شان کردەوە و رووبەرووم هات. خۆی
لێم گیف کردەوە، بە عارەبییەکی جلفی شیڕاندی:



– هەتیو، پێت دەڵێم «بچۆ ژوورەوە!».
لە شیڕاندنەکەی نەترسام، بەڵام لە حەژمەتی غەمی ماڵەوەمان،
ئازارێکی سەخت بە رۆحمدا دەگەڕا؛ زمانی قڵێشاندم:
– دایک و باوکم. ماڵەوەمان!
– ماڵەوەتان چی؟
– دەڕۆن، بەجێم دێڵن.
وەک ئەوەی گاڵتەم پێ بکا، لاساییمی کردەوە:
– بۆ کوێ دەڕۆن؟
– راماندەگوێزنەوە؟
بە هەمان شێواز:
– کێ راتاندەگوێزێتەوە؟
دەستم بە گریان کرد:
– حوکمەت. حوکمەت راماندەگوێزێتەوە.
– بەرەو کوێ؟
– بۆ ئێران.
– درۆ دەکەی. پێشتریش ئەمەت گوت.
– درۆ ناکەم، بەخوا راماندەگوێزنەوە. نازانم بەرەو کوێ!
بە بێباکییەوە وتی:
– بچۆرە ژوورەوە، چاوەڕێ کە!
دەمزانی کە دیسان مەبەستی ئەوە بوو چاوەڕێی «رەئیس» بکەم.
«رەئیسیش لە ژوورەوە خەوتبوو»، دەبووایە چاوەڕێ بکەم تا لە خەو
هەڵدەستێ و بۆ خۆی لێم دەپرسێتەوە! لە بەردەم دەرگای ژوورەکەدا،
دیسان رووم کردەوە پۆلیسەکە، بە چاو داوام لێی بەزەیی پێمدا
بێتەوە، دەستم بۆ ژوورەوە درێژ کرد، وتم:
– خەوتووە.
وتی: کێ خەوتووە؟
وتم: «رەئیس».
وتی: چاوەڕێ کە، تا خەبەری دەبێتەوە!
وتم: هەڵی بستێنم؟

تەنگاو بوو:
– نەء. نەکەی! خۆی خەبەری دەبێتەوە.
لالامەوە:
– ئاخر، خەبەری نابێتەوە.
تووڕە بوو، هاواری کرد:
– دەڵێم «بچۆرە ژوورەوە!»، کەرباب.
لەو دەمەدا، پۆلیسێکی دیکە، کە من پێشتر نەمبینیبوو (دیار بوو تازە هاتبووە لای ئەو پۆلیسەی هاوڕێی) دیتم: لەسەر چیچکان، تفەنگەکەی لەنێوان قاچەکانیدا راگرتبوو، پشتی بە دیوار دابوو؛ هەڵسایەوە و بەرەو لای دەرگاکە هات؛ رووی کردە من:
– باشە ئێوە نەفی نەکراونەتە ئێرە؟
بە قسەی ئەو پۆلیسە دڵم خۆش داهات، وتم:
– با.
وتی:
– ئەدی چۆن دەڵێی «راماندەگوێزنەوە»؟
– دیسان راماندەگوێزنەوە.
– ئێوە بە ئەسڵ خەڵکی کوێن؟
– مێرگەسوور.
– راتاندەگوێزنەوە بەرەو کوێ؟
گریام، وتم:
– نازانم..!
لەناکاو ئەویش تووڕە بوو، وتی:
– ئەدی بەم بەیانییە زووە لەکوێ بووی؟ خەڵک بەم سبەینەی ساڵحان لەو سەحرایە چی دەکا!
بواری وەڵامدانەوەی نەدامێ. دەم و دەست کاغەزێکی بۆری گرمۆڵەوەبووی لە باخەڵی خۆی دەرهێنا. دیتم، کاغەزەکەی خۆم بوو «ئەو کاغەزەی نەخشەی یاریکردنی فوتبۆڵێنم لەسەر دروست کردبوو، پۆلیسەکەی پێشوو لێی سەندبووم و دابووی بە ئەو». کاغەزەکەی پیشان دام و بە دەنگێکی تووڕەی ناقۆڵاوە وتی:



– ئەم کاغەزە چییە پێت؟ ها!
پاشان تفەنگەکەی شانی هەڵخزاندە پشتییەوە و توند قۆڵی گرتم، وتی:
– تۆ جاسووسیت.
رایکێشامە لای خۆی. دانوشتایەوە سەرم، کاغەزەکەی لە رووم نزیک کردەوە. پەنجە زۆر درێژە قەڵشتاوییەکانی خستە سەر هەندێ شوێنی ناو «نەخشەکە»، بە پەشۆکانێکی لەڕادەبەدەرەوە وتی:
– تەماشای ئەم کاغەزەی خۆت بکە! هجوم، دیفاع، هەدەف... ئەم شتانە چین لێرە نووسیوتن، ها؟!
من بیرم دەکردەوە، بەلامەوە زۆر سەیر بوو، دەمگوت:
– ئەم دوو پۆلیسە خۆ عارەبیشن، بەڵام بۆچی لەوە تێ ناگەن کە ئەم وشانە زاراوەی یاریکردنی فوتبۆڵن!
توند گوێچکەی گرتم و سەرمی لەگەڵ بادا، سمێڵی گیڤ، چاویشی لێم زەق کردەوە:
– ئەم نەخشەیە چیە پێت، قسە بکە!
من گریام. ئەو وتی:
– هی تەخریباتە؟
منیش لەتاو ئازاری گوێچکەم، زۆر بەڕوونی و فراوانی وەڵامم دایەوە:
– نەخشەی یاریکردنی فوتبۆڵێنە، ناوی برادەرە یاریکەرەکانمی لەسەر تۆمارکراوە.
گوێچکەی توندتر بادام، دوو جاران سەرمی لەگەڵ راوەشاند:
– هەمیشە ئەم قسە نەعلەتییە دووبارە دەکەیتەوە! هجوم، هەدەف، دیفاع.. ئەمانە چین؟ هجووم بۆ سەر کوێ؟ کام هەدەف؟ ئەم هەموو ئیشارەتە سەیرانە چین؟ قسە بکە، تۆ جاسووسیت! ئەم هەموو ناوانە کێن کە لێرە نووسیوتن؟
منیش نەمدەزانی بڵێم چی، چاش مابووم. لەتاو بەدبەختی و ئازاری خۆم، هەر هەنسکم دەدا و دەناورامەوە. لە کۆتاییدا گوێچکەمی بەردا، شانمی وەرسووڕاند، پالێکی بەرەو ژوورەوە پێوە نام، وتی:

– بچۆ ژوورەوە، دەی؛ تا «رەئیس» خەبەری دەبێتەوە!
منیش هەر دەلاڵامەوە:
– ماڵەوەمان، دەڕۆن. بەجێم دێڵن.
لە ژوورەوە، ناچار، بەدەم هەنسکەوە، چووم لەسەر تەنەکە ژەنگاوییە قوپاوەکە دانیشتمەوە. چارەسەری دیکەم نەبوو؛ دەبووایە چاوەڕێی ئەو پیاوە نوستووە بکەم، کە ئەوان ناویان لێ نابوو «رەئیس» : تا لە خەو هەڵدەستێ و ئەو خۆی تەحقیقم لەگەڵ بکات.
ئەم چاوەڕێکردنە درێژە بێـــهـــوودەیەم لەو زیندانە تاریکە بۆن میزاوییەدا، بەڕاستی، وردە وردە، وای لێکردم هەست بکەم کە ئەم پیاوە نوستووە «رەئیس» تاقە ئومێد و هیوایەکە بۆ ئازاد بوونی من: چونکە، کە بیرم دەکردەوە؛ دڵم خۆش دادەهات، دەمگوت: «رەئیس» لەوانەیە کابرایەکی دنیادیدە و چاو کراوەبێ، سەری لە فوتبۆڵ دەربچێت و بزانێ کە ئەم نەخشەیە، نەخشەی جاسووسی و تەخریبات نیە، بەڵکو پلانی فوتبۆڵێنە. ئەمە خوایە بەشکو بەرم بدەن و بگەمەوە ماڵ، لای دایک و باوکم!
لە ژوورەکەدا سیچەنم نەدەگرت، هەر بیرم دەکردەوە و چاوم بە دەوری خۆمدا دەگێڕا. ژوورەکەش هێندە تاریک بوو، هیچ شتێکم بۆ نەدەبینرا. تەنیا سێ قەرەوێڵەی کۆن (کە یەکێکیان کابرای رەئیس لەسەری نووستبوو) ، ئەوانی تریش کۆمەڵێک جلوبەرگ و قایش و پۆستاڵی عەسکەرییان لەسەر فڕێ درابوو، هەروەها دوو مێزی خواری لەق کە یەکێکیان پانکەیەکی شکاوی لەسەر داندرابوو، ئەوەی دیکەشیان زەمبیلێک ( وابزانم خورمای تێدا بوو، مشک و سیسرکە تەراتێنیان بەدەوریدا دەکرد) . بە خۆمم دەگوت:
– سەیرە، لە کازێوەی ئەم بەیانییەوە منیان لێرە راگرتووە، ئەم هەموو دەنگە دەنگە، ئەو هەموو ناڵە و فیغان و گریانەی من؛ چۆن کابرای رەئیس گوێی لە هیچ نەبووە؟ چۆن بەو هەموو دەنگە دەنگە هەر خەبەری نابێتەوە! لەسەر تەنەکە ژەنگاوییە قوپاوەکە دانیشتبووم و سەرنجی پیاوە نووستووەکەم دەدا. بەتانییەکی بەخۆدا دابوو، تەنیا سمێڵ و سەر و سەکوتی بەدەرەوە بوو: بێدەنگ، بێ ئەوەی هیچ



مرخەیەک یان هیچ جووڵەیەک بکا، تەنانەت هیچ نیشانەیەکی نە ماندوویی، نە خەونبینین، هیچ شتێکی ژیانی بەسەر روخسارییەوە دیار نەبوو. دڵم کەوتە ختوورە، بەخۆمم گوت:
دەترسێم ئەم پیاوە لە هە ردوو پۆلیسەکەی دیکەش مەندەبۆرتر و کەللەڕەقتر بێت؛ چونکە رەئیسیانە. خۆ لەوانەشە رەئیسی هەموو ئەم بیابانە بێت. رەئیس هەموو شتێکی لەدەست دێ، هەرچی بیەوێ دەیکا. زۆر لەوە دەترسام کە ئیتر، ئەگەر وابێت، نەک تەنیا دایک و باوکم بەجێم دێڵن و تازە ئیتر ببڕای ببڕ لە ژیانمدا نەیانبینمەوە، بەڵکو تەنانەت لە کۆتاییدا سەبارەت بەم پارچە کاغەزە نەگبەتە، گوللەبارانیشم بکەن! چارەگە سەعاتێکی دیکەش هەر بەدەم ئەم دڵەڕاوکێ و نیگەرانییەوە کاتم بردە سەر. لەو ماوەیەدا، سێ جاران دەنگی گڕەگڕی ئۆتۆمبیلم لە دەرەوە کەوتە بەرگوێ (کە زیاتریش لە دەنگی کامیۆن و زیلی عەسکەری دەچوو) ، لە دوورەوە، لەسەرەخۆ، رەت دەبوون و تێکەڵ بە دەنگی سەگوەڕێک دەبوون. هەموو جارێک، لەگەڵ گڕەگڕی هەر کامیۆنێکدا، دەمگوت: «ئەوە ماڵی ئێمەیە» ، «دایک و باوک و خوشکە بچکۆلانەکەی منە » ، «رایاندەگوێزنەوە!» نەمدەزانی ئاخۆ بەرەو کوێ، بەرەو چ مەڵبەندێک، چ هەوارێک؟
تۆتکەم لێ بڕابوو، خۆم پێ رانەدەگیرا. لەناکاو، دیسان، رەپێ بوومەوە، دەرگاکەم کردەوە و چوومە دەرەوە. لەپێش دەرگاکە، تەماشام کرد: پێش دەرگاکە کەسی لێ نەبوو، چاوم بەملا و بەولای خۆمدا گێڕا، هیچ کەسێکی لێ نەمابوو. ئەو ناوە، هەر بەتەواوەتی چۆڵ و هۆڵ بوو. سێرەم گرتە دوور، دیتم: کۆمەڵێک حوشتر، لەژێر بڕکە خورمایەکدا بەسترابوونەوە. لەو دەمەدا، لەناکاو، لەو چۆڵی و بێدەنگییە سامناکەی ئەو بیابانە سڵەمامەوە؛ هەستم بە تەنیایی و نامۆییەکی کوشندە دەکرد. هات بە خەیاڵما کە رابکەم و خۆم رزگار بکەم، بەڵام بەلامەوە کارێکی پەسەند و جوان نەبوو: دەمویست هەموویان، بە رەئیسیشەوە، دڵنیا بن کە من «هیچ تاوانێکم نەکردووە» و مافی خۆمە «ئازاد» ببم. بێ ئەوەی خۆم بمەوێ، بە نائاگاییەوە «وەک ئەوەی هۆگری و کۆنە پەیوەندییەکی زۆر بەتین بەرەو

لای کـابرای ڕەئیس کـێـشم بکات»؛ گـەڕامـەوە ژووره زندانەکـەم. چوومەوە نزیک قەرەوێڵەکەی، راوەستام. سەیری سەر وپۆتەڵاکیم دەکرد. دەستم درێژ کرد، بێدەنگ، قۆڵی رەئیسم گرت و راموەشاند، وتم:

– جەنابی ڕەئیس !

ڕەئیس هیچ جووڵەیەکی لێوە نەدەهات.

جارێکی دیکەش قۆڵیم راوەشاند و بانگیم کرد:

– رەئیس، رەئیس!

کەچی، دیسانەوە، هیچ جووڵە و وەڵامێکی نەبوو.

ئەمجارەیان، بەتانییەکەم لەسەری لادا و دەستیم بەرز کردەوە. کە دەستیم بەردا، بێ جووڵە، بێ گیان، بەسەر لەشیدا کەوتە خوارەوە.

زانیم کە ئیتر «رەئیس» مردووە!

بەدیار مەیتەکەوە، لەو ژووره خامۆش و تاریکەدا، خەریک بوو زەندەقم دەچوو. ویستم لە زیرە بدەم و هاوار بکەم، بەڵام نەء؛ یەکسەر رام کردە دەرەوە.

لە پێش دەرگاکەدا، دیتم لەناکاو، گەمارۆ درام: چوار پۆلیس، چوارشانە، کەتەی ڕەش؛ لەملاو لەولا، خۆیان لێم گیڤ کردبۆوە، شڵەژاو، لەسەر ئەوە بوون تەقەم لێ بکەن؛ بەرەو رووم دەهاتن؛ رووی تفەنگەکانیان لەسەر سنگم بوو. من زاترەک ببووم، بە حەپەساوییەوە سەیرم دەکردن.

ئەفەندییەک، سەرچەناگە کوتراو، لە ناوەڕاستی پۆلیسەکانەوە، کە قەرەوێتێکی شینی بەستبوو، دەم و چاو خوریکاوی، رووبەڕووم دەهات. یەکێک لە دوو پۆلیسەکانی پێشوو بە چوار پۆلیسەکەی گوت:

– بیگرن!

ئەفەندییە قەرەوێت شینەکە، گوێیەکی بڕابوو، پاشماوەی برینێکی قووڵیش بە نێوچەوانی چەپییەوە بوو (لە پیاوێکی منداڵبازی خوێڕی دەچوو ،کە شەوێک لە خەونێکی ناخۆشدا دیبووم)، بە مۆڕەکردنێکی دوژمنانەوە، وردە وردە، لێم دەهاتە پێشەوە. لە پۆلیسەکەی پرسی:

– خۆیەتی؟



پۆلیسەکەش گوتی:

– بەڵێ، خۆیەتی.

لەو دەمەدا گوێم لێ بوو، دەنگی گڕەگڕی زیلێکی عەسکەری، هێور هێور، ئاواییەکەی بەجێ دەهێشت؛ دوورتر و دوورتر دەکەوتەوە.

منیش، زارەترەک، گوناح؛ نەمدەتوانی تەنانەت هاواریش بکەم...

**پاریس**
**زستانی ١٩٨٩**

# داغەکەی پشتە دەستم



زۆر سەیرە ..!
خەریکە خۆشییەکی زۆر گەورە شادەمەرگم دەکا! دەترسم بەیەکجاری لەنێو ئاسوودەیی ئەم بیرهاتنەوەیەدا بمرم. چۆن بڕوابکەم ؟ ئاخر من کەی چاوەڕوانی ئەوە بووم، کە ئێستە، لەپڕ، لەم ساتە ناوەختەدا، بوتڵە عەرەقێکی بۆشی لاڕێگە، ئەم وەڵامە دوورەدەستە تەڵەزماوییەم بەدەستەوە بدات ؟ ئەم وەڵامە ون و نادیارەی کە چەندینساڵە من بەدوایدا دەگەڕام و بەدرێژایی تەمەنی منداڵیم پێی دەتلامەوە. سەیرە..! چۆن وا لەناکاو ئەم بیرەوەرییە لەناخمدا تەقییەوە؟ چۆن وا کت و پڕ، ئەو ئەشکەوتە تاریکەی خەم و گومڕاییم بۆ ڕووناک بۆوە، چۆن ؟
بەڵێ، من زۆر جاران بەناو شاری ڕەشی پڕ یادگارە تاڵەکانی منداڵیمدا گەڕاومەتەوە. هۆی گەلێک لە «دارکاری» و تێهەڵدان و لەماڵ دەرکران و جنێو و شەپلە تفەکانی باوکمم دۆزیوەتەوە، بەڵام هۆی ئەمەیان- ئەم داغەی پشت دەستم ؛ لێم ببووە تراویلکەیەک، بەندەرێکی ئێگجار دورر، هەرگیز پێی نەدەگەیشتم؛ هۆیە ناشیرین و مانای دزێوی ڕووداوەکەیم بیر نەدەهاتەوە. بەڵام ئێستە.. کە سەیریشە.. چۆن؟ ئەوەتا، هێور هێور، وەک خەونێک، دەکەوێتەوە سەر پەڕەی مێشکم. بەڵام سەیر بوو، خۆ من، تا ئێستەش، نەمدەتوانی باز بەسەر ئەو نەنگی و گومان و گومڕاییەمدا بدەم؛ وەک بڵێی جمکانەی برسێتی و ڕەتاوی و ئازاری ڕۆژانی منالیم بووبێ : قەت لە ناخم جوێ نەدەبۆوە. ئەو وەختە، من چاکیش بووم. کاتێ هەراشتر بووم، زۆر خەمناکتر، زۆر گومڕاتر، بێ حەوسەڵەتری کردبووم. ئەفسووس.. من ئەم هەموو ئازار و مەینەتییەم چۆن دایە خۆم؟ من باشیش بووم. هەرکە منالکارێکی دیکە بووایە... بەڵام ئاخر، لەگەڵ ئەوەش، خوایەکا؛ ئەم داغە پیس و قەبەیەی سەر دەستم چی بوو ؟ چی پێ کردم ! تەواو وەک برینێکی گوڕووی کرمەڕێز ئاسا. ئاخر، هێند بەس بوو کە من خۆشم قێزم لێی دەکردەوە و بە بینینی هێڵنجم دەهاتەوە؛ چجا خەڵکی! کە سەیرم دەکرد: منداڵە دەوڵەمەندەکانی دراوسێمان ئەنگوستیلەی زێڕ و سەعاتی خنجیلانە لەسەر دەستیان

دەبریسکانەوە، منیش.. ئەم داغە پیس و ناشیرینە لەسەر دەستم!
بەڵام بۆچ.. ئاخر بۆچ؛ منداڵێکی وەک ئەوسای من، دەبێ چیم کردبێ؟
تەنانەت ئەگەر تاوانێکی زۆر گەورەشم کردبێت، چۆن ویژدانی
باوکێک ئەمەم پێ بەڕەوا ببینێ ؟ چۆن؟ بۆچی؟ سزای چ تاوانێکی لە
تخووب بەدەرم بوو؟ خوایەکا.. چی بوو.. ئەم داغە؟ کەی، چۆن،
لەکوێ، لەپای چی نرا بە منەوە؟ چیم کردبوو؟ نەمدەزانی. نەخێر. من
ناهەق نەبووم. نەء ، ناهەق نەبووم کە بەدرێژایی ئەو هەموو ساڵە، ئەو
بێ دەنگییە نهێنگرە لەدڵ بگرم: بێ دەنگییەک کە لە هەستی خۆ بە
کەم زانین و گومڕایی و بێهوودەییمەوە هاتبوو. خۆ من، ئەوەتا،
ئەگەرچی کە ئەمە لە پایزی هەژدەیەمیشم دام، بەڵام سەبارەت بەم
پەتایەوە، بەقەد هیچ گەنجێکی ئاوزەی خۆم ئاسوودەیی و سەمیانیم لە
ژیاندا نەدی. منداڵیم هەمووی بەشەڕهاتن بوو، هەمووی هەر
دوورەپەرێزی و خۆ بە کەم زانین. هەرچی ئاشنا و هاوڕێم هەبوون،
هەمووم لەبەرچاو ڕەش بووبوون. پاش مردنی باوکیشم، شتە جوان و
چاکەکانم پتر لەبەردڵ شێوان. ئەم گرێ و گومڕاییە، لە ناخمدا، ڕۆژ
بەڕۆژ، گەورەتر و سەختتر دەبوو. ئیتر، هەموو باخچە و سەیرانگە و
سەرشەقامە جوانەکان، بەردەم دوکانی تێنس و یاریگە و
چاخانەکایش.. لێم ببوون بە دۆزەخ . قەتم ڕوو تێ نەدەکردن. تا
ڕادەی ترسان و زەوانی لێیان دەسڵەمامەوە. ئاخر.. من، چۆن بەم
هەستی گومڕایی و ڕووزەردییەمەوە، خۆم لەنێویاندا ببینیبا و
نەشمردبام ؟ باش بوو هەندێ جار شتەکانم لەسەر پەردەی بیر
لادەچوون، بەڵام هەر کە منداڵێکی شڕۆڵ و خەمناکی وەک خۆم یان
لاسووتاوێکی سەر ڕێگەییێکم دەکەوتەوە بەرچاو؛ تەبای جاران،
دەکەوتمەوە نێو دۆزەخە پڕ گومان و گێژاوەکەی خۆم. هەزار کەرەت
خۆزگەم بەوە دەخواست کە ئەم داخە، هەر لە سەرەتاوە، تیزابیشی
دەگەڵ بووایە و بنرایەتە ڕۆحمەوە. خۆ باشتریش وابوو کە.. بەڵام
نەخێر.. من بەدەست خۆم نەبوو.. لە هەمووی چێتر .. ئەوەم بەباشتر
دەزانی کە هەر دوورەپەرێزییەکە هەڵبژێرم. بەڵێ، من قەت شایانی
ئەوە نەبووم کە لەنێو هاوڕێیان و کۆڕ و قەرەباڵغیدا دانیشم بدوێم و



پێبکەنم. خۆ ئەگەر بەرێککەوتیش تێیان کەوتبام؛ دووبارە، شەرمی
زفتی و هەستی ڕیسوایی دایدەگرتمەوە. خۆ ئەگەر قسەیەک،
لاقرتییەکی واش کرابا کە تۆزقاڵێک پێوەندیی بە دزێوییەکەی
پشتەدەستی منەوە هەبووایە؛ دەم و دەست، وەک جرجێکی ترساو،
لاشە سست و بوودەڵەکەی خۆمم دەکشاندەوە و ملی ڕێگای بژاڵەیی
خۆمم دەگرت. ئاخر، بۆ مناڵکارێک، زۆر زەحمەت و ڕیسواییە کە بە
داخێکی قەبە و پیسی پشتە دەستییەوە، بێت لەنێو خەڵک و
هاوڕێکانی خۆی دابنیشێت و بدوێت؛ هەمیشەش، ئەو برینە گوڕووەی
سەر دەستی بە لچکێکی کراسە شڕەکەی بشارێتەوە! گەر
بیشارێتەوەش، داخە پڕ سوێ قەبەترەکەی ناخی بۆ ناشاردرێتەوە.
ئاهـ ، خوایەکا! سوپاس بۆ ئەو سەرخۆشە میهرەبانەی، کە بەم بوتڵە،
خۆی، دوێنێ شەو تەسکینی دەردی دڵی خۆی دا؛ ئێستەش هی من.
من ساڵەهای ساڵ بوو تەنانەت شەوانەش خەوم لێ دەزڕا. سەبارەت
بەو ڕووزەردی و هەستی خۆ بەکەم زانینەم بەرامبەر بە خەڵک،
دەگریام. لەژێر لێفە شڕەکەمدا، ئێستەش لەبیرمە: چۆن بەزەلیلی، چەند
بەکەساسی دەگریام! زۆر جارانیش کاتێ ماڵە خزمەکانم، ماڵی مامم،
یان کچە عازەبەکانی پوورم: ئەوانەی کە بە جوانی و خشڵ و کۆشک و
خانووبەرەی خۆیان دەنازین، کاتێ دەهاتنە میوانداریی دایکە
کلۆڵەکەم، چاک بیرمە؛ چۆن لەژێر پەردەی سوعبەتەوە بەردی قسەیان
دەگرتە زاتی شووشەیینی بێ گەردی من. بەبیرمە، بەدایکمیان دەگوت:
– کوڕەکەت هیچ کچێکیش نابێ شووی پێ بکا!
ئاهـ ، چەندیش ئەو بەختە ڕەشەی خۆمانم خۆش دەویست، کە
سەرباری ئەم دزێوییەشم، هێند پەرپووت و نەدار مابووینەوە.
دەمویست قسەیەک، شتێک لە ڕوویان بڵێم، ئەوشتانەی کە ئەوسات
تەنها وەک کۆمەڵێ لۆمە و جنێو نەبوایە دەرنەدەبڕدران. بەڵام نەء ،
هیچم نەدەگوت: تەنها بە گریانێکی کپ دڵی خۆمم دەشۆردەوە، ئەو
گریانەی کە ئەوانی نێو کۆشک و تەلاری، هیچ بە برسێتی و
خەمناکیمان ئاشنا نەدەکرد. هەرچۆنێ بێ، پێویست ناکا. وادیاربوو..
ئاهـ سەیرە.. من دەڵێی تازە پەی بە هەندێ شت دەبەم. بەڵێ. ئا، بێ

گومان ئەگەر من کوڕی باوکێکی هەژار نەبووبام، ئەم گومڕایی و نەنگییەم قەت تووش نەدەهات. ئەوسات ئەوانیش واهی زەلیل و برینداریان نەدەکردم. نەء. دەی، با وابێ. قەیناکە. من زۆر شت لەو منداڵە ئازاردراوەی ناخم فێر بووم کە هێشتاش هەر لەنێو ئەم زاتە سووتاوەمدا زیندووە.

دەی باوابێ..

پێویست ناکا..

با قەتیش هێندە ئاوڕ لەو ڕابردووە پڕ گومڕایی و خەفەتە نەدەمەوە ، نەء.

ئەوەیە.. من ناهەق نەبووم. چۆن ناهەق بم. نەخێر، قەت، ناهەق نەبووم. ئاخر لەم شارە بەڕەڵاو پڕ گوناھ و نەفرەتەی ئێمەدا، ئێستەش منداڵە هەژارانی وا هەن تاوان دەکەن، دزی و کەتنی گەورە دەکەن، یان بە پیاوە خوێڕییە تەزبیح بە دەست و منداڵبازە سمێڵ فشەکانی بەردەم سینەماکان فریو دەدرێن؛ دایک و باوکیشیان پشتە قوونیان یان پشتە دەستیان داخ دەکەن. ئێ ئاخر خۆ منیش منداڵە هەژارێک بووم: دەست خۆم نەبوو، خەیاڵم دەنێو قوڕی پەیتی ئەم گومڕاییانە دەچەقی و دڵم پێیانەوە دەئەنگوا. ئێستەش لەبیرمە: هەرکە وێنەی ڕووداوێکی زفت و بێزەوەری لەم جۆرەم لە خەیاڵی خۆمدا نەخش دەکرد، ئارەقەی ڕیسوایی تنۆک تنۆک بە بناگوێمدا دەهاتە خوارێ؛ نەدەبوومە تنۆکە فرمێسکێکی زەبوونی و دابچۆڕێمە ناخی زەوی.. دڵخۆشیی خۆم بەوە دەدایەوە کە من هیچ یادگار و ڕووداوێکی زفتی واهیی خۆبەدەستەوەدانم بیرنەدەکەوتەوە. ئەدی چی بوو؟ ئەم داخە چی بوو لەسەر پشتی دەستم؟ ئاخ، سەیر بوو. ئەم پەژموردەیی و بیرنەهاتنەوەیە وای لێ کردبووم کە خۆم وەک مناڵکارێکی زۆر بێ مێشک و بێیاد دابنێم. کە هەموو جار پرسیاریشم لە دایکە کڵۆڵەکەم دەکرد، لە وەڕسی و پێنەزانینی خۆیدا، کۆمەڵێک جنێوی بۆ باوکەکەم دەنارد، کە ئەم مۆرە پڕشەرمەزارییەی دابوو لە نێو چەوانی منەوە. هەمووجار دەیگوت: «چما ئەمن تائێستەش دوو قسانم دەگەڵ ئەو باوکە توند و تووڕەیەت کردبوو!؟».



ئاه بۆ ئەو باوکە زاڵمەم. پیاوێکی چەند تووش و دڵڕەق بوو. قومارکردنەکەشی، زێتر دڵە گچکەلانەکەی دەکوڵیم. نازانم ئەم خووەی.. ئا، لەوانەیە لەو بێ پارەیی و بێ دەرەتانییەوە بووبێ کە سەرانسەری ماڵەکەمانی گرتبۆوە. بیرمە چۆن شەوانی تاریک و سارد، درەنگانێ، کاتێ لە قاوەخانەکەی نێزیک ماڵەکەمانەوە، دۆڕاو، بە بەدمەستی و هیلاکی دەگەڕایەوە، قومار و عەرەق باخەڵی پێ چۆڵ کردبوو. دایکم لەژێر لێفەکەوە، بە چرپە و بەدزییەوە دەیگوت: « ئەوەتا، قەللۆش، دیسان هاتەوە». ئەویش (قەللۆش) لە حەژمەت و وەڕسیی خۆیدا، هەرچی بەردی ڕقی خۆی هەبوو، بەسەر دڵی من و دایکە کڵۆڵەکەمی دەشکاند. هەندێ شەویش، بە هات و هاوار و جنێو، لە ماڵیی وەدەردەنام و ڕێگەی شەقامە تاریک وشۆستە ساردە سامناکەکانی پێ دەگرتەبەر: بن درەختێک، کورسیی بەجێماوی چایخانەیەک.. تەڕوەنەیی و نامۆییمیان دەگرتە خۆ. ئەم زاڵمە، چەند دڵڕەقانە، هەر لە منداڵیمەوە، لە مەکتەبی دەرهێنام و پەلکێشی دوکانەکەی خۆی کردم. دوکانەکەیشیم باش بە بیر دێتەوە. ئا. ئێستەش لەبەرچاومە: دوکانێکی قەسابیی قەبارە ناوەنجی بوو، لە نێوەڕاستیەوە بە فایبەرێک کردبووی بە دوو لەتەوە، دەرچەیێکی لە نێوەڕاستدا بۆ هاتوچۆ جێ هێشتبوو. کاری لە بەشی پێشەوەیدا دەکرد، بەشی دوواوەشی کە تایبەت بوو بۆ ئێواران؛ پێکی عەرەق و مەززەی تێدا دادەنا و تێیدا لەگەڵ ئەو ژنە قەرەج و کیسەفرۆش و سۆزانییانەی کە وادەی پێ دەدان، دادەنیشتن؛ ئاهەنگی تەڕ و پڕ ئەلهای خۆیان تێدا دەکرد. پشتەوەی ناو دوکانەکەی کردبوو بە نیوە مەلهایەک بۆ خۆی. ئاخ ، من لەو ساتانەی کە ئەوان، لەپشتەوەی ناو دوکانەکەدا، لەناو رووباری رووتی لەززەتدا، ئالابوونە یەکتر و ئاخ و ئۆفیان بوو؛ من لە برسێتی و ڕەتاویی خۆمدا، چەند بەکەساسی، چەند بەماندوویی، لەبەردەم دوکانەکەدا هەڵدەترووشکام! چەندیش هیوام بەوە دەخواست کە لەوساتانەدا، گەر بۆ تەنها چەند ساتێکی کەمیش بووایە ئیزنی دابام، بۆ نەختێ هیلاکی لەلەش دەرکردن، پشوویەک لە باوەشی گەرم و پڕمیهری دایکمدا بدەم؛ گەر بۆ تەنها جارێکیش بووایە هەستم

بکردایە منیش منالێکم..

ئاهـ، خوایەکا، بۆچی من تائێستاش ناتوانم باز بەسەر ئەو برسێتی و بێ بەرێتی و نامۆییەی ڕۆژانی منداڵیم دا بدەم؟ ئاهـ.. من ئێستەش چەند حەزدەکەم ببمەوە ئەو منداڵەی جاران و، باوکەکەم بێتەوە لام؛ گەر بۆ تەنها جارێکیش بێ لە باوەشم بگرێ و چنگم پڕبکا لە نوقڵ و پارە! چەند حەزدەکەم ببمەوە ئەو منداڵەی جاران، شەڕواڵێکی خاوێن و بێ پینە لەبەربکەم، گەر بۆ بەیانییەکی تەنها یەک جەژنیش بێت، بەدیار فلیمێکی سینەمایی کاوبۆی.. رینگۆ.. دابنیشم و.. قەتیش.. گەورە نەبم! بەڵام نەخێر.. نەخێر.. هەموو ئەو شتانە ئێستە تەنها خەیاڵێکن بە بەرچاومدا دێن و هیچی تر. ئەم پیاوە منی، دوور لە هەموو ئەو شتانە، کردبووە سێبەری خۆی؛ تەنها لەو کاتانەدا لێی جوێ دەبوومەوە کە بۆ ئێشێکی ماڵەوە، چێشت هێنانی نیوەڕۆیان، کارێکی زەحمەت و دوور، یان کە بۆ عارەق کڕین، یانیش کە بۆ ژووان پێدانی ئافرەتێکی سۆزانیی دۆستی، بەرەو گەڕەکێکی دوور و گەرمی پڕ کەند و لەند و چڵپاو دەیناردم. تەنها ئەوساتانە بوو کە من لەژێر چەپۆکی قورس و سێبەری پڕ قینی ئەم پیاوە دوور دەکەوتمەوە. ئاخ، ئەو مرۆڤە چۆن بێ بەریی کردم و مانای شتەکانی لێ گوڕیم. تەنانەت بەهۆی ئەم داخەوە مانای خۆمیش، مانای هەموو ئەو خۆشنوودی و تێری و ئاسوودەییەش کە بە سەرسامییەوە لە هاوڕێ پۆشتە و دەوڵەمەندەکانی خۆمم دەدی. بەڵام باشە، ئاخر من، نازانم، هەتا زیندوو بوو، چۆن نەمکرد پرسیاری ئەو گرێ و گومڕاییەی خۆمی لێ بکەم؟ زەحمەت بوو. نەمدەوێرا. چما.. هەر لە منداڵییەوە ترس و سامێکی ڕەشی واهیی دابوومێ کە لەبەرامبەریدا زاتی هیچ نەکەم. ئەوەبوو، ئیتر، چیم بکردایە. دەی. ئاخر، من، چۆن نیگەران و گومڕا نەبووبام؟ من لەدووای هەموو لاساری و بزۆزییەکم، لەدووای هەموو میز بەخۆدا کردنێکی شەوانەم، دەمزانی لەسەر ئەو تاوانە دیارکراوەم سزا دراوم. یان هەندێ نیوەڕۆیان، کاتێ چێشتی نیوەڕۆیانم لە ماڵەوەڕا بۆی دەبرد، بەدیار ئەو حەوزەوە رادەوەستام کە منداڵان مەلەیان تێدا دەکرد و هەڵماتێنیان لەدەوروپشتیدا دەکرد، دەوێستام و ئێرەییم بەبەختیان



دەبرد؛ لەبیرم دەچۆوە کە نیوەڕۆیە و «بابە» برسیتر و هارتر دەبێ، چێشتەکەیم بە درەنگ وەختی و بە ساردەوەبوویی بۆ دەبرد. یان لەو ساتانەی کە درهەمێک یان دوو درهەمێکم لە دەخیلەکەی لێ دەدزی. یان کە لەگەڵ منداڵە دەوڵەمەندێکی دراوسێ بەشەڕ دەهاتم. لە هەموو ئەوساتانەدا بەئاشکرا هۆی سزادانەکانی خۆمم دەزانی؛ ئێستەش یەکە یەکە، وەک ئەوەی دوێنێ و پێرێ ڕوویان دابێ، دێنەوە بیرم. بەڵام هۆی ئەم داغە، ڕووداوی ئەم داغە، تەواو سەراسیمە و بێ نوودی کردبووم. تا ئەم ساتەش هەمیشە خۆمم پێی دەخواردەوە: ئاخۆ دەبێ چ ڕووداوێکی ناشیرین، چ تاوانێک لە من رووی دابێ ؟ ئەم پرسیارە پڕ تەڵزمانە تا ئەم ئێوارەیەش هەر دەیانتلاندمەوە، وەک خەنجەرێکی تیژ ڕۆچووبوونە ناخم. بەڵام ئێستە.. ڕاستیەکەی، سەیریشە.. چۆن باوەڕ بکەم؟ ئەوەتا.. خەریکە شادەمەرگم دەکا. من ئێستە پێکەنینم دێ. ئاخر، چۆن پێ نەکەنم! من بەو ڕۆژە چۆن پێ نەکەنم؟

ئەو رۆژە ـ داخ بۆ ئەو رۆژە ـ باوکەکەم، وەک گەلێک ئێوارەی دیکە، لە ماڵی ئافرەتێکی سۆزانیدا ژووانی هەبوو، دوکانەکەیشی بەتەمای من لێ گەڕابوو. منیش، لە درەنگانی ئێوارەکەدا، دەست خۆم نەبوو، میزم دەهات و یەکجار تەنگەتاو ببووم. نەدەکرا بچمە مزگەوتی نێو بازاڕەکە و دوکانەکە بێ خاوەن جێ بهێڵم: دەمزانی گەر بهاتایەتەوە دوکانەکەی خاڵی بینیبا، شێتگیر دەبوو، دارکارییەکی کافرانەی دەکردم. زۆریش لەوە شەرمەنتر و بەتەمەنتر بووم لەنێو بازاڕێکی وا قەرەباڵغدا بەپێوە میز بکەم. گوریسم لێ گەشتبووە هێچکان. ئیدی، خۆشم نەمزانی چۆن بوو، خۆم لەودیو فاییەری دوکانەکەمان دۆزییەوە: لەو شوێنەی کە «ئەو » ژنە قەرەج و سۆزانییەکانی تێدا لە باوەش دەگرت و عارەقی تێدا دەخواردەوە. لەوێدا، باش بوو، کەس نەیدەدیم. بەڵام، هەر زوو، لەوێشدا، ترسی ئەوەم لێ نیشت کە ئاخۆ ئەگەر بێتەوە هەست بە بۆن و گۆماوی میزی من بکا، چیم بەسەردێنێ؟ بۆ بەدبەختیم، میزەکەم کردە نێو یەکێک لەو بوتڵە عەرەقە لاملکەوتووانەی ئەوێ. بەمە سیچەنم گرت و هەموو شتێکم بیرچووەوە، تەنانەت بوتڵە عەرەقە پڕ میزەکەش. هەتا ئەم ئێوارە فێنکەی

ئێستەش؛ من نەمزانی ـ چۆن بزانم ـ کە دووای من، باوکم، بە سەرخۆشی، دێت هەمان بوتڵە پڕ میزەکەی من دەنێتە سەر دەمی خۆیەوە!

**هەولێر: ١٩٧٩**



# ناونیشانێکی نوێ

کاسەی سەرت، پایتەختێک ئاسا، قیژ و هۆڕ و حەشامەتێکی گەورەی تێدا دەزرینگێتەوە. ڕوخسارە خەمناکەکەت پەستتر دەکا. دەتەوێ شەقامەکان تەی بکەیت. شۆستە و شەقامەکانیش پڕن لە دوکان و مزگەوت و باڕ و ئوتومبیل و عارەبانە و غەریب و شێت و پۆلیس و کەر و خەڵکی ماندوو. لەنێو زاق و زیق و گەرد و فێنکایی ئەم ئێوارە درەنگەدا، بە کراس و پانتۆڵێکی شڕەوە، دیارە: گەنجێکی دڵناسک و غەریبیت، باوکت لە ماڵ دەریکردووی ! باش دیارە: سەری خۆت هەڵگرتووە و پشتت کردۆتە زوڵم و زەنا و دەستی زبری باوکێک. عەللاگەیەک و کۆمەڵێک کتێب بەدەستەوە، وەک لە ڕێگەیەکی نامۆ و دوورەوە هاتبیت، بەهێمنی، چاو دەگێڕیت؛ دڵیشت وەک تۆپەڵە سەهۆڵێکی سەر ئاگر دەتوێتەوە و ناشتوێتەوە...

لەم ئێوارە درەنگەدا، بێ ئارامیت زێتر دڵت دەکۆڵێ. زاتێکی چەند بریندار و تەنهایت! ئەگەر ئێستە گەورە و بچووکی ئەم شارە، دوور و نزیک، ناسیاو و نەناسیاو، بێن و دڵت بخەنە ئینجانەی خۆشەویستییەوە و سەهای سۆزت بەسەرەوە بکەن: تۆ، هەموو ڕۆژگارەکانی منداڵی و گەنجیت ئاسا، هەست بە هیچیان ناکەیت. ناتوانیت. ناتوانیت باز بەسەر دڵە شکاوە پەتۆڕەکەتدا بدەیت. گەردەلوولێکی وشک هەڵیگرتووی، ئێستە لەم شەقامانەدا غەوارەی کردوویت. کوڕی ئەمشارەشیت؛ چەندساڵێک دوورکەوتنەوە و خوێندن لە شارێکی دیکە دەسخەڕۆی یاگە و کوچە و شەقامەکانی شارەکەی خۆتت ناکا؛ دەسخەڕۆی نامۆیی و زگارییەکەشت ناکا. سەیرە! خۆشت بیر دەکەیتەوە: بۆچ ئاخافتنی ئاشنا و هاوڕێکانم سەمیانم ناکەن؟ چیمەن و سینەما و کۆڕ و گازینۆکان هیچ جوانی و ئۆخژنێکم پێ نابەخشن. ئاهـ.. لێمشتی ئەو شادییە بۆچ بە بیابانی دڵی منیشدا ڕانابووری؟ کاشکا لەم تێنوێتی و برسێتییە بێ ئامانەی ڕۆحم دەگەیشتم. بەڵام، بەچی؟ چی بکەم! بەس تەنهاییم.. تەنیا تەنهاییم قوتبی خەم و ئۆخژەنەکانم لێک نێزیک دەکاتەوە.



جگەرەیەک دادەگیرسێنیت. ئەمە یەکەم جارت نیە. بە بیرتە، چەند جارێکی دیکەش، ماڵە جەنجاڵ و پڕ غەوغاکەت بۆ باوکە بەدمەست و دایکە هاجەکەت بەجێ دەهێشت، ئەو باوکەی کە هەرچەند بیری لێ دەکەیتەوە، دڵنیانابیت کە باوکتە! هەمیشە بە تف و جوێن و کۆڵەمست و شولاق بەلەنگازت دەبۆوە و تەڕوەنەی کۆڵان و شەقامە سارد و تاریکەکانی دەکردیت. هێمنی و ئاسوودەیی لە ژیانی تۆدا، تەنها ئەو ساتانەی شەو دەستی بەسەرت دادەهێنا کاتێ باوکت، لەناو تاریکیی شەقامەکانەوە، لەگەڵ چەند زەلامێکی سمێڵ فش و کەتەی دیکە، بەرەو چایخانە نێزیکەکەی لای ماڵتان، بۆ قومارکردن و خواردنەوە لێژ دەبۆوە. ناشزانی ئەو زەلامە، قینی چ پاشایەکی ترسنۆکی لە کتێبە؟ لەوەتەی تۆ کتێب دەکڕیت و دەیخوێنیتەوە، ئەویش لێتی دەدڕێنێ و دەیسوتێنی. تۆش کاتت زۆر لە بەختی خۆت خۆشتر دەوێ. ئەوەتا، ئەم ئێوارەیە، دەڕۆیت؛ بە یەکجاری؛ سەر هەڵدەگریت، بێ گەڕانەوە...

جگەرەکەت فڕێ دا. بە خەمێکی بێ پایانەوە لە قەرەباڵغی و تێکچڕژانی شەقامەکە ورد دەبیتەوە. لەناکاو هۆڕن و زریکەی ڕیزە ئوتومبیلێکی ڕەنگاوڕەنگ ڕاتدەچڵەکێنێ. سواڵکەر و عەرەبانچی و ژنە قەرەج و پاکەت فرۆشەکانی سەر شەقامەکە، بەپەلە، بەرەو سەر شۆستەکە دەخزێن. ئاخۆ ئەم زەماوەند و خۆ لەبیر بردنەوەیە لە داخی چ ماتەمین و پرسەیەکی گەورەی ئەم شارەیە؟ بەبێدەنگی، چەند شتێک لەناو ناختدا دەشکێن. چاوە گەش و خەمناکەکانت بەرز دەکەیتەوە. دەتەوێ زووتر ژووری ئوتێلێک بدۆزیتەوە؛ ئوتێلێک کە جێگەی ژان و حەسرەتی پاکی لاوێتیت بکاتەوە، ئوتێلێک عەللاگە و کۆمەڵە کتێب و سەرە کاسەکەتی تێ باوێی. دەبێ چەند ئوتێل لەم شارەدا هەبێت کە نرخی نوستنەکەی نەبێتە ملۆزمێکی دیکە بە گیانتەوە؟ دەگەڕێیت. با بزانی. تاریکییەکە خەستتر دەڕژێ. شەقامەکانیش، وردە وردە، لە خەڵک چۆڵ دەبن. ئوتێلەکانیش پتر لانەواز و سەرباز و زگورتی و قاچاغچی و ئاوارەکانی تێ دەڕژێ. ترسێک دەکەوێتە دڵتەوە: دەشێ

لەبەر ئەو لادێییە کۆنە جوتیارانەی بۆ کرێکاری هاتوونەتە شار، لەبەر ئەو میسری و هندۆسییە کرێکارانە، شوێنت لە هیچ ئوتێلێک نەبێتەوە. ئارەزووی جگەرەیەک داتدەگرێ. دەستت دەنێیتە گیرفانتەوە. پەنجەکانت ساتمە لە نامەکەی (زەینەب) دەکەن. هەموو فلیمی خەون و خەمەکانی سالانی رابردووت بیردەکەوێتەوە. سێبەرێکی چەند گەورەیە بەسەرتەوە! هەموو شەقام و کۆلانەکانی شارەکەی ئەوت چەند خۆش دەوێ! ئێستە ئەو لێتەوە دوورە. تەنها نامە خەمڕەوێنەکانیەتی کە خەم و خۆزگە و خەونەکانیت پێ دەناسێنێ. دێڕێکی نێو نامەکە لە مێشکتدا بلاچەی دا: «ئەو ژیانەی ئێمە دروستی دەکەین، نە گۆشەیەکی خەمی تۆ دەبێت و نە چوار دیواری دزێوی دەوری من».

مژێکی قوولت لە جگەرەکە دا. بە چەند پێپیلکەیەکی ئوتێلەکەدا سەرکەوتیت. وەلامت درایەوە. کرێیەکەی، باشە، زۆر گران نیە. موقیمیت تاکو ئەم سەرە مانگە. پێویست ناکا کەس هیچ جەنتایەکت بۆ هەلبگرێت. بارت سووکە. دەرگای ژوورێکی بچووکت کردەوە. کیسە نایلۆن و کتێبەکانت لەسەر قەرەوێلەکە هاوێشت. دۆشەگ و بەتانیەکە لە خەمت زۆر کۆنترن. دیوار و قەرەوێلەکە لە خۆت زۆر شەکەت و خەماوی تر. تەواو، ئیتر، لێرەدا ئالای خەمە ئەبەدییە کۆچەرەکەت هەلدەدەی. نەفرەت لە هەموو باوک و مالە باوکێک! هەر لێرەشدا، لەم هوتێلەدا، لەم ژوورە تەنیا و سەربەخۆیەدا، ژان و یادگار و کوورینەکانت دەنووسیتەوە. ئیتر، کەس ناتوانێ خەم و خۆزگە و خەونەکانت سەر ببڕێت، هیچ کەسێکیش – بە ناوی ئەوەوە کە باوکتە ئیتر – ناتوانێ داوا و داخوازی و فەرمایشتی قۆڕ قۆڕت بەسەردا فەرز بکات، کتێبەکانیشت چیتر ناسوتێنرێن. وێنەی زەلامێکی کەتەی سمێل قیت، کە لە ئەکتەرێکی سینەمایی دەچێ، بە قەد دیوارەکەوە، سەرنجت ڕادەکێشێ. باوکە توند و تووشەکەی خۆتت هاتەوە بەر چاو. لەبەرچاوتە: ئەم عەسرە، چۆن، دایکت بەزەیی بە قژی سپیی خۆی و شەڕەفی ئافرەتە سۆزانییەکەدا دەهاتەوە؛ باوکت تووڕە بوو:



– دەتانەوێ یان ناتانەوێ؛ ئەمەیە ئیتر. پێلاوی ئەمانە بە هیچ کامتان ناگۆڕمەوە.

بەلاتەوە گرنگییەکی وای نەبوو ئەم جۆرە دیمەنانە بهێنیتەوە بەر چاوت. بەهێمنی، لە پەنجەرەی ژووری هوتێلەکە ورد بوویتەوە. ئەمەش کاری هەموو کەسێکی خەمناک و تەنهایە لە ژوورێکی واهیدا. پەنجەرەکە، بەسەر دیوارەکەوە، لە تابلۆیەکی تاریکی پڕ ئەستێرەی زەردی دوور دەچێ. نێزیکتر بوویتەوە، لێیەوە لە شەقامەکەت ڕووانی. شەقامەکە، وەک چەقۆیەکی پێ پێشان درابێ، چۆل و بێدەنگ مابۆوە. دەنگی گۆرانیی چەند سەرخۆشێک نەبێ، کە تێکەل بە دەنگی حەپەحەپی سەگە دوورەکان دەبوو.

گەڕایتەوە سەر قەرەوێلەکەت. مێشکت جوی. دەفتەری یادگارەکانت دەرهێنا. چۆن بتوانی چیرۆکی ملیۆنەها برسی و قەرەج و ئاوارە و خەلکی بێکەس بنووسیتەوە؟ خوێنی سەدان جوانەمەرگ و شەهید و کوژراو بکەیتە مەرەکەبی قەلەمەکەت؟ ئەو زەوییانەی کە بوومەلەرزە یان بورکانێک قووتیان دەدا، ژانی خەلکە برسی و ڕووتەلە سنگ قۆپاوەکانی دنیا، ئەو ژنە بەدبەختە ئەسمەرانەی کە لە تێنویتیدا شیریان لە مەمک وشک دەکا، ترسی ئەو کچ و زارۆکانەی لەژێر ناپالمدا دەزریکێن، ئەو لادێیانەی دەسوتێنرێن.. چۆن بتوانیت؟ چۆن بتوانیت شتێکی واهی بنووسیت و دلی بێ ئۆقرەت ئۆقرە پێ بگرێ؟ کەی گیانی مرۆڤ لە دووا تنۆکەی خەم و فرمێسک خالی دەبێ، خوایەکە؟ دەشگریایت و دەشتنووسی. هێشتا نووسیت. ئارەقەیەکی گەرمت دەردا. هەستایتەوە.

لەپڕ دەستت دایەوە قەلەمەکەت، بۆئەوەی بۆ چاوانی تاریک و پڕ خەم و حەسرەتی (زەینەب) بنووسیت: ئەو چاوە تاریک و پڕخەمانەی کە خەم و خۆزگەکانی خۆتت تێیاندا دۆزییەوە، ئەو چاوانەی کە تێیاندا مەلە دەکەیت و دەگریت و پێدەکەنی و سەمادەکەی. کاغەزێکی نوێت لە بەردەم قەلەمەکەت راخست بۆئەوەی نامەیەک بۆ زەینەب بنووسیت. نووسیت:

« خۆشەویستم، زەینەب گیان،

« له شارەکەی خۆمدا غەریب و بێکەس و تەنیا و بێ پارەم،
« هەتا کارێک دەدۆزمەوە، لەگەڵ وشە جوانەکانتا، هەندێک پارەم بۆ ڕەوان بکە ! ».
کە نامەکەت داخست، ناونیشانی تازەی خۆتت لەسەر زەرفی نامەکەتدا بەجێ هێشت.

**١٩٨٠**



# زێنەب و شتی تریش

هەڵسە!
ده هەڵسە، دەی.. ڕەپێ بەوە !
هەمووی چەند چرکەیەک نابات و.. تەواو.

دەی، مەهێڵە هیچ پەشیمانی و نیگەرانییەک داتبگرێتەوە؛ بەسیش هێندە ئاوری ئەو ڕق و تووڕەییە بێهوودەیە بۆ ڕابردوو بدەرەوە ! بێ فایدەیە. هەڵسە؛ بوخچەی فرمێسک و خەم و برینەکانت بپێچەوە و بڕۆ!

ڕەنگە تا کازیوەی بەیانیش، کە هەموو لا لە خەو هەڵدەستن، کەس پێ نەزانێ. نەء ، کەس پێ نازانێ. بواری ئەوەش مەدە کەس پێ بزانێ! با ڕۆشتنەکەت چاوەڕوان نەکراو، خەمناکانە، زۆریش خەمناکانە بێت. دە، هەڵسە.. دەی!

.. ئاهـ! تۆ ئێستا دووایین شەوی عومرتە! بەدڵ حەزدەکەی بۆ دووایین جار، دووایین نیگای حەسرەت و ماڵئاوایی بە ژووره شڕ و ساردەکەتدا بگێڕی. ئەوەتا، کە ئاوڕ بۆ تەنشتت دەدەیتەوە: کامیاری برا بچووکەکەت لەنێو نوێنە شڕەکەیدا بەخەوتوویی ڕاکشاوە. کە سەیری دەکەی: نەخشی ڕووزەردیی سەر دەم و چاوی، پڕ خەمتر و زگارترت دەکا. ئەفسووس.. دە هەڵسە؛ دووا ماچی وەفاو میهری خوشکایەتیی خۆتی لێ بکە و بڕۆ!

تۆ ئێستا، کە ئەم ڕێگا سامناکە دەگریتەبەر، زۆر ئاسوودەیت، زۆریش بەختەوەر؛ بەڵام داخی تۆ داخی سبەینێیە. ئاخۆ دووای تۆ، لەناو گەڕەک دەبێتە چ ژاوەژاوێک؟ ئاخۆ ژنان و کچانی دەرودراوسێ دەیکەن بە چ مقۆمقۆ و فستەفستێک؟ دەشێ هەندێکیان بەگوێی یەکدیدا بچرپێنن، بڵێن:

– «کچێکی گێل بوو؛ نەدەبووایە ئەمەی بکردایە».

ئەو کاتە [شەونم] و [حەسیبە]ش دێن، بە گریان لە بەردەم خەڵکەکە کەساسی و ماتەمینییێکی زۆر دەنوێنن. بەڵام نەخێر.. نەء.. ئەم دوو خوشکەت، هەرکە هەواڵەکە دەبیستنەوە، لە ئاسوودەییان مەرگەشاد دەبن. ئا، بەڵێ، وەک ئەوەی لە شەڕێکی سەختدا، بێ ماندوو بوون، بێ دەست پیس بوون، سەرکەوتبن؛ لە ناخەوە



دەتریقێنەوە. شتاقیشیان هەستی ئەو پێخۆشبوون و ئاسوودەییە بەئاشکرا بۆ ئەوی تر دەنابڕێ: بێدەنگ، خۆشی و ئاسوودەییەکە بەس لەنێو دڵیان، تەنیا لەنێو دەمارە باریکەکانی خوێنیاندا دەگەڕێ. ئەم ڕۆشتن و نەنگییە پڕ شەرمەزارییەی تۆش، بەس تەنها چەند هەفتەیەک دەبێت و دەبڕێتەوە. تەواو ئیتر.. لەمەودووا خێوی هیچ بەدبەختییەک لە ماڵەکەدا نامێنێ. بەرەکەت و خێر و خۆشییێکی زۆر ڕوویان تێ دەکا. ئا، لەمەودووا تەنانەت بیست و پێنج فلسییێکیش چیە لە کیسەی ئەوانەوە چیتر بەخەسار ناڕوا. بەڵێ، دووای تۆ، زۆر چێتر و پۆشتەتر، زۆریش ئاسوودەتر لەچاو ئێستە دەژین. بێگومان، خەرجیی گەشت و گەڕان و سەفەرت، خەرجیی کراس و ژێرکراس و قوتووە مکیاجە جۆراو جۆرەکانت، هی جەنتای جل، هی بابووج و شووشە بۆن و تا مەمکدانەکانیش.. هەمووی بۆ خۆیان، بۆ نێو سنووقە گچکەڵەکەی نێو دەلاقە رزیوەکە دەگەڕێتەوە. تەواو.. ئیتر هیچ لۆمە و سەرزەنشتێکیشیان نامێنێ! ئیتر لەمەودووا هەموو ژیانیان، هەموو ڕۆژێکیان لە ماڵەکەدا بەئاسوودەیی و بەهێمنی بەسەردەبەن: بێ ئەوەی هیچ ئێوارەیەکی دیکە بتبینن، رەتاو، لەشداهێزراو، بگەڕێیتەوە ماڵ و جەنتا بچووکەکەی دەستت بەبێزارییەوە بۆ سەر قەرەوێلەکە تووڕ هەڵبدەیت، پاشماوەی بۆن و ماچی پیاوێکی سپلەش هێشتا بەدەم و سنگ و بەرۆکتەوە مابێ و کاس و دڵگرانیان بکا! بەڵێ، ئیتر هیچ بەیانییێک هەستی ئەو ئێرەیی و قینەش دایاننناگرێ لە ئاستت. هیچ جارێکی دیکە ناتبینن بەو ڕێکپۆشییەوە بچیتە بەر ئاوێنەکە، سەروقژت ڕێک بکەیت و پەنجە بە شوێن پاشماوەی ئاوڵە پیسەکانی سەر ڕووە چرچ و لۆچەکەت دابهێنی؛ پاشانیش بە هەنگاوی بێباکانە، بەرەو «وەزیفە»، دەرگای ماڵ لەدووی خۆتەوە بەسەریاندا دابخەیت؛ ئینجا لەو سەرەوەش، کە دێیتەوە ،کۆمەڵێ گەنج و ئەفەندیی مل بەبۆینباغ لە سەری کۆڵانەکەوە بەدوواتەوە بن!

تەواو. تەواو، ئیتر.. لەمەودووا هیچ فستەفست و چرپەچرپێکی پڕ قینی شەوانەشیان نامێنێ. بەڵام سەیرە: چۆنە ئەمشەو وا بێدەنگن؟ قەت ئەوان نین. تۆ بڵێی لەودیو ئاگایان لەم پڕۆژە خەمناکەی تۆ

هەبێ؟ ناشێ. ئەدی کەواتە ئەم بێدەنگییە چییە ئەمشەو؟ ئاخۆ ئێستە لەنێو ئەم بێدەنگییە سامناکەیاندا چی دەکەن؟ ڕەنگە هەر دانیشتبن. ئا، دوور نیە. هەر دانیشتوون. ئەوان، ئەوا ماوەیەکە، هەموو شەو، تا سەعات یەکیش هەر نابۆرژێن، خەویان لێ ناکەوێ؛ هەمیشە بەدەم وەنەوزەوە جینگڵ دەدەن و کەلەکان دەگۆڕن؛ کە تەواو وەڕس و هیلاکیش دەبن، تەبای دوو کۆتری ماندووی بریندار، دەکەونە سەر پشت، چاو لە کاریتە بە دووکەڵ ڕەش و سنگ دەرپەڕیوەکانی بنمیچی ژوورە تەنگ و بۆرەکە دەبڕن؛ بەبێدەنگی، بەبێ گڕ، لەنێو دۆزەخی خۆیاندا هەڵدەقرچێن و ناشمرن. ئاه.. ئەم دوو خوشکەت جاران وانەبوون. نەخێر، قەت وانەبوون. ڕووخۆشی و گەمە و گاڵتە و شەڕە سەرینی جارانیان لەکوێ و ئێستە لەکوێ! نەخێر. ئا، تۆ چاک هەستت پێ کردوون. داخ.. هێندە مانگە دانەڕزاویت لەنێو قینیان.. شەقت نەبردووە. بەڵێ.. ئێستا هەرکە داوایان لێ دەکەیت لە گەڵت بێنە بازاڕ، یان سەردانی ماڵە خزمێک، قەت بەو گەرم و گوڕییەی جارانەوە وەگەڵت ناکەون: بیانووی نەخۆشی، بێ تاقەتی، دەدۆزنەوە و خۆیانت لێ دەدزنەوە. ئێستا وەک شەوانی جاران شیشەی چنین و کۆکلە و سانتیمەکانیان ناهێننە پێش دەرگا و تا درەنگی شەو لەگەڵ کچان و ژنانی دراوسێ شەماڵە بگرنەوە، یان بەدەم کڵاوچنین و ساوەر بژارکردنەوە بنێشت بجوون و قسەوباس بکەن. وا نەماون. ئێستە وەک بڵێی بە شتێکی زۆر ئەرژەنگ و مڵۆزمی دەرەوە ترسێنرابن، هەر لە ئێوارەوە، دەرگا لەسەر خۆیان دادەخەن: بەهێمنییێکەوە، کە لە هەستی ڕیسوایی و ڕووزەردییەوە هاتبێ، دەخزێنە ژوورە تەنگ و نووتەکەکەیانەوە. نەخێر، ئەمانە قەت ئەو دوو خوشکە ئاساییەی جارانت نین. چاوانیان لە ڕوونی و قووڵیدا دیارن؛ درەوشانەوەی گڕی هیچ ڕق و گومانێکیان تێدا ناشاردرێتەوە. نەء. هەرگیز لەو چاوانە ناکەن کە جاران خۆشنوودی و تەنهایی خۆتت تێیاندا دەدۆزییەوە. نەخێر. قەت لەو چاوانە ناکەن. ئەودیو هەموو زەردەخەنەیەکیان بارێک داخ و سەغڵەتی و حەژمەتە لێت. خۆ تۆ بە گوێچکەی خۆشت هەموو لۆمە و تەسەلا و تانووتێکیشیانت



بیستۆتەوە. ئا.. ئەوەتا ئێستەش ـ لەودیوەوە ـ خۆیانن، گوێت لێیانە. بەڵێ. بێگومان چرپەچرپ و لاقرتێی ئەوانە دێتە گوێچکەت. ئا.. ئەوەتا باست دەکەن، هەر هەمان وشە و قسە پڕ لۆمە و تۆسەنەکانیانە، دەیلێنەوە. بێگومان لەوانەیە ئەم قسانەشیان بەبێ گریان، بەبێ هەنسک بۆ نەگوترێ. نەء. ئا.. (شەونم) گەلێک گرینۆکە. ئەوەتا، ئەمە نووزە و هەنسکهەڵدانی ئەوە، وەک خەمناکترین ئاوازی سەر گۆڕێک، دێنە گوێچکەت. بەڵام (حەسیبە) گەورەترە. وەک ئەو ناگری؛ بە سنگی خۆیەوەی دەنووسێنێ و دڵێ دەداتەوە. لە ناخیشدا پڕە، پڕە لە ڕق و داخ و سەرزەنشت. ئەم، وەک ڕووبارێکی بەهاژەوە، کەفچڕ، بە شەپۆلی سامناک و شێت دەستەویەخەت نابێتەوە: ئەم، ئەو شەپۆلانەی بەبێدەنگییێکی پڕ لە خەمەوە دەخنکێنێ. ئاخۆ کەی بێ بتەقێتەوە؟ بتەقێتەوە و وەک لافاوی نەفرەتی نووح لەگەڵ خۆیدا ڕاتیمالێ. کەی؟ بۆ نەء؟ بێگومان لەدەستی دێ. ئەوەی ئەم ئێوارەیەش کردی هیچ نەبوو لەچاو.. نەء. ئاه. تۆ خۆزگە قەت خۆت بەم شێوەیە نەدیبایە! دەی.. با وابێ. ئاخر، هەقیشیەتی. ناهەقی نیە. بەڵێ. تۆ خوشکی گەورەی ئەویت و هەموو ورد و درشتێکت ئاگا لێیە؛ ئەویش دەستی ناوەتە دەستی کوڕەکەی مەولوودە شەلی باخچەوان. ئەوێ ڕۆژێ، بێ ئاگایی تۆ، بە پوورە هەیبەتی دراوسێتانی گوتبوو بەڵکو بە ماڵی کوڕە دەڵێت و دێنە داخوازیی و ئیشەکە دەبڕێننەوە! مەولوودە شەلی ناڕەسەن گوتبووی:

– «جارێ با بمێنێ.. بەردێکی لەسەر دانێن».

بەڵام لەدووایییدا لای دراوسێیان گوتبوویان:

– «ئێمە کچێک ناخوازین کە خوشکی زێنەبی سۆزانی بێ؛ هەموو گەڕەک ناوبانگی بیستۆتەوە».

تەنانەت ئەوەشیان خستبووە سەر کە ئێستە خوشکەکانیشی بەبیانووی هێلکە فرۆشتن هەموو پاش عەسران تا سەعات دووی شەو لە ماڵی شەریف ئاغا دەمێننەوە. ئەوەیە، ئیتر.. ئاخۆ قەیرە کچێکی سۆزانی لە وەها شارێکی ڕەش و بەڕەڵادا چاوەڕوانیی چی لێ دەکرێ؟ چی پێ دەگوترێ: جگە لە نەفرەت و غەیبەت کردن؟ بەڵام سەیرە!

ئاخر.. تۆ ـ خۆت، قەیناکە: بەڵام ئەم دوو خوشکەت بۆ؟ تۆ تێناگەی، گوناهی ئەوان چیە؛ ئەوان بۆچی لەنێو ئەم چڵپاوە ڕەشەدا، ڕووزەرد و مل کەچ، سەروقژیان هەر بەتەنهایی و بەڕیسوایی سپی بکەن؟ نەخێر، نەء، حەیفە؛ تۆ قەت ئەم گوناهە ناکەیت. تۆ لەنێو ئەم گوناهە گەورەیەدا تا دووایین هەناسەی عومرت هەرگیز لەخۆت نابووری. نەخێر. هیچ دڵۆپە فرمێسکێکی دیکەشت لە گیاندا نەماوە کە بۆ گوناه و خەفەتەکانی ئایندەتی هەڵبرێژی. تۆ ئێستا گیانێکیت خاڵی لە فرمێسک. چیتر ناتوانی باز بەسەر ئەو سەمەرگی و کلۆڵییە ساماناکەیاندا بدەی. نەء. بەڵام داخ، تۆ درەنگ هەستت بەم دۆزەخەیان کرد؛ وەلێ تەواو، دەبڕێتەوە: هەمووی چەند ساتێکی دیکە نابات. دە ، هەڵسە! نەء ، هیچ ئاهێکی لۆمە و سەرزەنشت هەڵمەکێشە؛ هیچ حەسیبەش بە دڵڕەق و بێ وەفا و بێ نمەک مەدە قەڵەم، نەء. یادی شەڕ و شاتەشاتی ئەم ئێوارەیەشی، بەیەکجاری لە مێشکتدا بسڕەوە! حەسیبە هەقیەتی، زۆریش هەقیەتی. تۆ دەزانی: مێرد بۆ ئەوان واتە زۆر شت. دە، ئەوەیە. وادیارە ئێوە، ئێوەی قەیرە کچی نێو خانووە ڕزیوەکان، هەمیشە دەبێ پیاوێکتان هەبێ پێتان بڵێ کە ئێوە ئاسوودەن؛ هەمیشە دەبێ پیاوێکتان هەبێ پێتان بڵێ کە ئێوە هەن. ئەفسووس، بەڵام ئەدی بۆچی، بۆ تۆ، هیچ پیاوێ نەبوو: لەگورگی چەپەڵ و چڵێس زیاتر، بۆچی بۆ تۆ هیچ پیاوێ نەبوو؟ ئاهـ. دەی. باوابێ...

هەناسەی خەفەتێکت هەڵکێشا:

ژیانی ئێوە، وەک جۆگەلەیەکی هێور، چەند خەمناکانە ڕابورد! هەر لەو ساتەوە کە بابە مالاوایی لە دنیا کرد، ئیتر ئێوەش هێلانەی بەختەوەری و نموودیتان لێ تێک چوو. تۆ تەنیا ئێستا، هەرکە بیری لێ دەکەیتەوە، تەنیا ئێستا هەست بەوە دەکەیت کە ئەو پیاوە چ سێبەر و دالدەیەکی مەزن بوو بەسەرتانەوە! کچەکانی پوورە زبێد و پوورە سەفیەتی دراوسێتان، بەدرێژایی ئەو ڕۆژانە، کیسەی کاغەزیان لە بازاڕ دەفرۆشت و بە شرووب فرۆشتن ڕاهێنرابوون؛ بەڵام بابە.. باوکی ئێوە.. ئەمەی پێ شەرم و سووکی بوو: لە کلاو دروین و دروومان زێتر



ڕێی هیچی دیکەی نەدەدانێ؛ تامابووایەش هەروا بە ئارەقەی خۆی بەخێوی دەکردن. بەڵام ئەو ڕۆیشت.. ناگەڕێتەوە! هێندەی پێ نەچوو دایەش، لە حەژمەت و نەخۆشییان، جێتانی هێشت. چیتان کردایە؟ هەبوون.. کە هەبوون، ناچاربوون بەشێوەیەک بژین. تۆ لە هەموویان گەورەتر بوویت، لە هەمووشیان پتر.. تۆ زێتر هەستت بەو کۆست و زیانە گەورەیە دەکرد. نەتهێشت شەونم بە قسەی خۆی بکاو واز لە مەکتەب بهێنێ، واتکرد حەسیبەش هەر خەریکی دروومان و لیفکەچنین و کۆڵووانە هۆنینەوە بێ بۆ ژنان و کچانی گەڕەک. خۆشت ڕووت کردە وەزیفە وکارگە، کارگەی شووم و بەدبەختیی تۆ، ئەو کارگەیەی کە دوو خوشکەکەت، ئێستا و ئێستاش، هیچ لە ڕیایی و بەڕەلایی و زوڵمی تێناگەن. مەخابن. هەزار مەخابن: تۆی کچە کێویلەی لیفکەچنی نێو چوار دیواری ڕزیوی بۆر، لە سەرەتادا نەتدەزانی چ گورگ و درندانێک خۆیان لەودیو ئەو دیوارە ڕەنگاوڕەنگانەدا حەشار داوە. نەتدەزانی. ئاهـ. گەر بتزانیایە؛ لە ناختدا هەرچی میهر و هەرچی برسێتی و هەوەس بوون، لەنێو خۆتدا دەتخنکاندن: ئاسکێک ئاسا ، زۆر تێنوو بۆ ئاو؛ هەر بەس تەنها لەدوورەوە، لە بۆنی پیاو و ڕەنگی ئۆتۆمبێل ورد دەبویتەوە؛ بام تا هەتایە بە سکێک تێر و بە دە برسی بشمابانەوە ! چی بوو؟ ئاهـ.. تۆ ئێستە پەشیمانی! زۆریش پەشیمان. دڵشاد زۆڵ بوو، دووای هەر کەڕەتێ نەختێ پارەی لە چنگت دەنا و دەیگوت: «دەتهێنم!». هەرئەم خۆشی بە شاکری زەڕەنگەر و شەوکەتی مغازەچیی ئاشنا کردی: ئەو شەوکەتەی لە نرخی زێڕ و پارە و هەوەس زیاتر، هیچی لە مانای وەفا و میهر و خۆشەویستی نەدەزانی. بێهوودەیە.. تازە بەسەرچوو. ئێستە دەشێ کەودەنترین پیاو، خوێڕیترین پیاویشت پێ ڕازی نەبێ. ئاهـ، کێ بڕوای دەکرد ئەو لەشە ڕێکە، ئەو ڕووە جوانەت هێندە زوو بەسەرچێ؟ کێ بڕوای دەکرد ئەو دوو خوشکەت، گەر بۆ تەنها جارێکیش بێ، دڵیان لێت بشکێ؟ بەڵام ئەمڕۆ ئەوەتای: بۆ ئەوان بوویتەتە دۆزەخ! باشیشە کە ماون. دە ئەوەتا، ئەوا دووایین تنۆکە فرمێسکەکانی گیانتە و.. بۆ ئەوانی هەڵبرێژە! بەڵام نەء ، مەگری! بەسیش هێندە خەفەت لە

ئازاری شاتە شاتی ئێوارەکەی ئەمڕۆ بخۆ.! نەء.. مەگری.. هیچ پێویست ناکا. دووای تۆ، ئەوان، هیچ ڕووزەردی و هیچ کڵۆڵی و ئازارێکیان نامێنێ. خەڵکیش ئیتر ڕێزێکی زۆریان لێ دەنێن. ئەو کاتە هەموو سێ سەرەمانگێکیش جارێک دەچن تەقاویتییەکە وەردەگرن و بەسەرخۆیانی دابەش دەکەن. پارەی ماڵ چیتر بە هیچ گەشت و گەڕان و شمەکێکی نەفرەت لێکراوی تۆ بە خەسار ناچێ. بێگومان کە شووشیان کرد، ئیتر بە خاتوون و خانم بانگ دەکرێن. ئا..

دە هەڵسە، دەی!

دەی.. بەس هێندە ئاوڕی ئەو رق و تووڕەییە بێهوودەیە بۆ ڕابردوو بدەرەوە! بەسیش هێندە بەسەر گوناە و یادگارەکانتدا بڕشێرەوە. دە هەڵسە.. دەی.. ئەوەتا: چەقۆی نێو قاپلەمەکە لێتەوە نێزیکە. هەڵیگرە! هەمووی چەند چرکەیەک نابات و.. تەواو، بەرەو دووایین ماڵی ئاسوودەی عومری خۆتت بەڕێ دەخەن! چەقۆکەت بە دەستێکی لەرزۆکەوە گرت. وەک ئاسکێکی ترساوی پەل بەستراوی دەستی مردن، هێنکە هێنکت وێ کەوتبوو. نووزەنووزی هەنسک و قوڵپی گریان، وەک دەنگی گیاندارێکی نامۆی زۆر ماندوو، بە ژوورەکەتدا بڵاودەبۆوە، هێمنییەکەی دەخورپاند. لە توێی فرمێسکە ڕوون و قەتیسەکانتەوە، سەرنجت بڕیە ئاوێنە هەڵواسراوەکەی قەد دیوارەکە: دەستت بە چەقۆکەوە لەرزی. پێش ئەوەی چەقۆکە بچەقێنیتە دڵتەوە، لە ئاوێنەکەوە خوێنی قەترانیی خۆتت دیت ڕژا. پێش ئەوەی لەگەڵ تێسکەی ئازاری گیان دەرچوونتدا بقیژێنیت، گوێت لە قیژەی خۆت بوو، وەک شێت بەسامناکییەوە لە هارژنت دا. کامیاری برا گچکۆکەت، بەتەنیشتتەوە، لەنێو نوێنەکەیدا، وەک پشیلەیەکی نووستوو، ڕاچلەکی: سەرسامانە، بەرامبەرت دەمی داپچڕی. چەقۆکەت لەدەست بەربووەوە. بەسەر کامیار دا نووشتایتەوە. بە چاوێکی پڕ فرمێسکەوە، بە گیانێکی میهرەبانی پڕ لە تاسە و سەرگەردانییەوە، چاوانی سەرسام و پڕ سۆسە و پرسیاریت لە ئامێزی خۆتدا حەشار دا...

**١٩٨١**



# گوڵاڵە کێویلەکانی کۆتەڵ

کە پەنجەم بە زەنگی دەرگاکەوە دەنا ، هەمیشە ئەو بۆخۆی دەهات دەرگاکەی لێ دەکردمەوە. کە گوێم هەڵدەخست، هەستم دەکرد: لەدوورەوە، وەک پەپوولەیەکی گەورە، دەکەوتە ناو حەوشەکە؛ دەنگی نەرمی هەنگاوەکانی، خشەخشی کراسەکەی، بەدرێژایی حەوشە بۆنخۆشە، ئەملا و ئەولا بە چیمەن رەنگاوەڕەنگەکەیان، دەروونی پاراو دەکردمەوە. خۆم ئامادەد ەکرد پێی بڵێم:

«ئێوارەباش، شادان!»

«ئێوارەباش»

من لەبەردەم دەرگاکەیاندا زەردەخەنەم شەرمی لێ دەنیشت. دەیگوت:

– وەرە ژوورەوە!

لەودیو دەرگاکەوە وەپێشم دەکەوت. لە حەوشە باریکەکەیاندا، لە شەرمان نا ، بەڵام بۆئەوەی دڵنیاببم، خۆم واپیشان دەدا کە سەیری رێحانە و گولیلکەزەرد و سوورەکانی قەراغ چیمەنەکەیان دەکەم. بەچربە لێم دەپرسی:

«کێی لێیە ؟»

ئەویش، بێ ئەوەی ئاوڕم لێ بداتەوە، لە من سلۆکتر دەیچرپاند:

«کەس، هەر دایکم» .

بەم وەڵامە، راهاتبووم. ئیتر بێ دڵ لەدڵ دان، بێ شەرم کردن، بە پێپیلکە نزمەکەدا سەردەکەوتین ولە دەرگای دوودەریی هۆڵەکەوە دەچووینە ژوورەوە.

ئاه! بەڵام ئەمجارەیان.. ئەو نازانێ کە «منم» لە دەرگا دەدەم، نازانێ کە لەم پاش عەسرە ناوەختەدا «کێیە» ، «چ کەسێکە» لە دەرگا دەدا! هەرگیز بیری بۆ من ناچێ.

لەوانەیە ئێستا ، وەک زۆربەی دەمەوعەسرانی رۆژانی جاران، لە کونجێکی ژوورەکەیدا، یان (وەک عادەتی پێوەگرتبوو) لەناو چیمەنەکەیاندا، لەسەر ئەسکەملییە جۆلانەییە سەوزەکەدا، بەکراسێکی ئاودامان تەنکەوە دانیشتبێت و کتێب بخوێنێتەوە؛ لە ماندوویی و غەمگینیی خۆیدا، خۆی لە بیستنی زەنگی دەرگا گێل بکات و



لێگەڕێ دایکی، یان سوعادی خوشکی بێن  دەرگاکەم لێ بکەنەوە.

باجی سوعاد، خوشکی گەورەی! وابزانم بە حەوت ساڵ– ئا ، بە حەوت ساڵ لە خۆی گەورەتربوو. ئاخ لەو ئێوارە نەگبەت و پڕ شوورەییە! تەریق دەبمەوە. بەڵام خۆ ئێمە، چاوەڕێی ئەوەمان هەرگیز نەدەکرد!  بە بیانووی دەرس خوێندن، لە ژوورەکەی بنەبانی ماڵەکەیاندا: هاتبووە سەر کۆشم، هەر دوو دەستی توند کردبووە ملم، سنگی بە سەروپۆتەڵاکم نووساندبوو، هەر دوو قاچیشی بەملا و بەولای کەلەکاغدا شۆڕ کردبوونەوە؛ لەناکاو، خڕڕەی مشتووی دەرگاکە هات، رایچڵەکاندین «باجی سوعاد» بوو. کە ئێمەی بینی، سوورهەڵگەڕا، بەڵام هیچی نەوت، چاوی داخست و بە پەلە پڕووزێ دەرگاکەی لەسەرمان داخستەوە.

من ئیتر لەو رۆژەوە، گەر بمزانیبا «باجی سوعاد» لە ماڵەوەیە، ئەوا بۆ سەردانێکی کورتیش بووایە، نەدەچووم؛ تەنانەت ئەگەر بەڕێکەوتیش لە ماڵەکەیان بوومایە و باجی سوعاد بهاتایەتەوە، بەهیچ شێوەیەک لە ڕووم نەدەهات چاوم لە ئاستی بەرزبکەمەوە.

سەیر دەبێ! نەکا ئەمجارەیان «باجی سوعاد» خۆی، بێت دەرگاکەم لێ بکاتەوە؟ دڵنیام: دووای ئەو هەموو ساڵ و عەیامە درێژە، دیمەنی ئەو ئێوارەیە، وەک زرنگەی زەنگێکی کۆن کە لە کەنیسەی ئاواییەکی دوور دەنگ بداتەوە، لە مێشکیدا زەنگ دەداتەوە. خۆ لەوانەشە کە چاوی پێم دەکەوێتەوە، باوەڕ بە چاوی خۆی نەکا ، بە لایەوە زۆر سەیر بێ: دووای ئەو هەموو ساڵ و عەیامە زۆرە، من وەک خێوێک یا فریشتەیەک پەیدا ببمەوە و دووبارە بێم لە زەنگی دەرگاکەیان بدەمەوە و پێی بڵێم: «ئێوارەباش، باجی سوعاد!» . سەیرە! نازانم! (شادان) بەدرێژایی ئەو ساڵانە، لەو نامانەی بۆی دەناردم، هەرگیز هەواڵی سوعادی خوشکی بۆم نەدەنووسی. لە هیچ نامەیەکیدا نەمخوێندەوە بڵێ: «سوعادیش، شووی کرد!» . وەختی خۆی دەیگوت:

«باجی سوعادم شوو ناکا» ، «دووای ئەوەی دەزگیرانەکەی گیرا و لە سێدارە درا، ئیتر دنیای لەپێش چاو رەش بوو» .

دەی، پێویست ناکا . تەنیا چەند ساتێکی ترە، تەنیا چەند

دەقیقەیەکی ترە و دەگەمە بەردەم ماڵەکەیان. هەواڵی باجی سوعاد، تریفە، ئاسۆ، یەکە یەکەی براکانی، کچە پوورەکانی، هەواڵی هەموو کەسێکی لێ دەپرسم.. هەواڵی «چنوور»، «پەخشان»، هەموو دەستە خوشکەکانی تریشی- کە لە زانکۆ هاوپۆلمان بوون: ئەوانەی ئێرەییان بە ئەوینی پاک و پەلکەزێڕینەیی ئێمە دەبرد، ئەوانەی خۆشیان دەویستین. ئاخ- هەزار خۆزگە بۆ ساڵانی قوتابییەتیمان! خەونێک بوو. خەونێکی خۆش! هەموودەمەوئێوارەیەک، کە دەوامی زانکۆ تەواو دەبوو، ئێمە لە حەژمەت ئەوەی کە دەبوایە لەیەکتری جودا ببینەوە، غەم و نیگەرانییەکی قووڵ دادەگرتین، بەڵام نا، شەو هێندە زوو دانەدەهات: هێشتا چەند سەعاتێکی دیکەشمان لە تریفەی خۆر، لە رووناکی، لە شەقام و پیاسە.. بەدەستەوە هەر مابوو. لە شەقامەکەی بەردەم زانکۆوە، بەجووتە، بەدەم پیاسە و قسەی خۆشەوە، بەرەو کۆڵانە تەنگەبەرەکەی نزیک قوتابخانەی (هەڵکەوت) لێژ دەبووینەوە، تا دەکەوتینە سەر چوار ڕیانەکەی جادەی (تووی مەلیک). لەوێوەش، ئیتر دەوروبەرمان رەنگینتر، هەوا خۆشتر، دنیا جوانتربوو. وردە وردە پیاسەمان خاوتر دەکردەوە، بەرەو شەقامە درێژەکەی (ئیبراهیم پاشا). رۆژێکیان، بەبیرم دێ، لەسەر سووچەکەی (ئیبراهیم پاشا) راوەستابووین، بەزەردەخەنەوە پێی وتم:

«چەندم حەزدەکرد ئەو شەقامە درێژتر بووایە!».

گوتم: «بۆچی؟».

گوتی: «بۆ ئەوەی پیاسەکانیشمان درێژتر بوونایە».

ئیتر کە دەگەیشتینە کۆتایی ئیبراهیم پاشا و گۆڕستانەکەمان بەتەواوەتی لێ وەدیار دەکەوت، لە کۆڵانی تەنیشت «مەعمەلی سەهۆڵەکە» قەیرێکی دیکە رادەوەستاین: غەمێکی تەنک دەنیشتە سەر روخسارمان، وەک ئەوەی هەمووجارێک دوایین جار بێ کە خواحافیزی لەیەکتر بکەین. لەکۆتاییشدا، کە دەڕۆیی، من هەر لە شوێنی خۆم رادەوەستام، بۆئەوەی «لە دواوەڕا» ببینم: بە لەنجەیەکی شیرینەوە قوونی بابدا و بە کۆڵانە هەورازەکەی خۆیاندا سەربکەوێ. تا دەگەیشتە چوارەم دەرگا، بە دەستە راست: دیوارێکی بلۆک چنی



هەمیشە مەیلەو تەڕبوو، چەند لق و گەڵاو چڵێکی سەوز، بەئاستەم ملی باریکیان بەسەر دیوارەکەدا شۆڕکردبووە. لەبەردەم دەرگا، بۆ دووایین جار، سەیرێکی دیکەی دەکردمەوە و وەژوور دەکەوت.

ئاه، تۆ بڵێی ئەم دیمەنانە وەکوو خۆیان... بەڵام دەی، هەر تەنیا چەند ساتێکی ترە، چەند دەقیقەیەکی ترە. ئەوەتا، ئەوەتا دووای پێنج ساڵ دەربەدەری و هەڵات هەڵات و خانووبەکۆڵی، ئەوەتا وا سەرلەنوێ «ئیبراهیم پاشا» و «مەعمەلی سەهۆڵەکە» وەدیاردەکەونەوە.. ئەوەتا!

بەخوا کە منیش گەلحۆ و ترسنۆک بووم! هەقیەتی. ئەگەر بە بێ وەفاشم تێ بگا. هەقیەتی، ئاخر، من، لە ماوەی هەموو ئەو پێنج ساڵەدا، تەنیا یەک جار، تەنیا یەک جار- ئەویش زۆر بەپەلە و تەنگەتاوییەوە توانیم بێمە ناو گەڕەکەکەی ئەوانەوە. نیوەشەوێکی تۆف و سەرمابوو. لەبیرمە. کۆمەڵێک بەیان و بڵاوکراوەم پێ بوو، لەگەڵ سێ چوار نامە بۆ (دایکی شەهابە لووتە)؛ دەبووایە بەیان و بڵاوکراوەکان بە دیوارەکانی ئیبراهیم پاشادا هەڵبواسم، نامەکانیش بگەیەنمە ماڵی شەهاب لە (سابوونکەران). نەمدەتوانی خۆم دووابخەم. بەبیرم دێ، تەنانەت لە ماڵی شەهابیش، نەمتوانی تەنانەت دیشلەمەیەکیشیان لەلا بخۆمەوە؛ یەکسەر بە دیوی «حەمامی نالی»یەوە، کە لەچاو ڕێگای (بەر دەرکی سەرا) چۆڵتر و خامۆشتربوو، خۆم گەیاندەوە هاوەڵە پێشمەرگەکانی ترم لە (مەجید بەگ): بۆئەوەی لەوێ، هەموومان، لە ماڵی «باجی زلێخا» کۆببینەوە و خۆمان ئامادە بکەین کە لە کاتژمێری «یەک ونیوی شەو» بەسەر ئەمنە سوورەکەدا بدەین.

هەرچۆنی بێ، لەلای ئەو پێویست ناکا ئەم شێر و ڕێویانە بهێنمەوە. هەقیەتی. لە نامەیەکیدا، نووسیبووی: «باش دەزانم: تۆ دووجاران دابەزیویتە ناو شار، کەچی هیچ جارێک بەخەیاڵتا نەهاتووە نەک بێی لە ماڵەوە سەرێکم لێ بدەی، بەڵکوو تەنانەت لە سووچێکەوە تەلەفۆنێکیشم بۆ بکەی. هیچ نەبووایە بۆئەوەی کەمێک گوێم لە دەنگت بووایە». هەقیەتی هەرچی گازاندە و گلەییەکم لێ بکا، هەقیەتی. سەرەڕای هەموو ئەمانەش ئەوا دووساڵی رەبەقە، نەمتوانیوە

هیچ نامەیەکی بۆ بنووسم. دوو ساڵی ڕەبەقی هەڵات هەڵات و ئەم شاخە و ئەو شاخ ، ئنجا دووای ئەوەش پەڕاگەندەبوونم بە دیوی ئێراندا. ئەمانە، نەک هەر ئەو، بەڵکو ناوی خۆشمی لەبیر بردبۆوە! بەڵام مخابن، چی بکەم!
دڵنیام: (شادان) ئاگای لەوە نیە کە من لە ماوەی ئەم دوو ساڵەی دوواییدا، لە شاخەکانی (سلێمانی) دوورکەوتبوومەوە: وێڕای هەموو تیپەکەمان، هێزی حکوومەت جێگایان پێ تەنگ کردین، بە گازی کیمیاوی و تەیارە و بۆمب ڕاوەدوویان ناین بەرەو دۆڵ و کێوەکانی لای (بادینان). ئاگای لەوە نیە کە من لە ماوەی ئەم بۆمبـاباران و شەڕوشۆڕەی دوواییدا، دوو جاران برینداری کراوم. ئاگای لەوەنیە: من لەم ماوەیەدا چ ئازار و ئەشکەنجە و ئاستەمێکی دۆزەخیم چەشتووە؛ چۆن، هەمیشە لە گوند بە گوندی، شاخ بەشاخی ئەم کوردستانەدا، لە هەموو سات و چرکەیەکدا، هەر بۆ ئەو گریاوم، هەر ناوی ئەوم لەسەر زار بووە! ئاه! ئاگای لێ نیە! چۆن بزانی؟ ئاخ! سەیرە! لە وڵاتی خۆشماندا‌ین، هیچ دەریا و سنووڕێکیشمان لەنێواندا نیە، کەچی ناتوانین، ناتوانین یەکتر ببینین.. ناتوانین تەنانەت بە نامەش دەنگمان بگەیەنینە یەکتر! چ دۆزەخێکە!
هەموو ئەو ڕۆژگارە سەختانە، بەسەرچوون! ئێستاش ئەوەتا: گەڕاومەتەوە، دیسانەوە لە سلێمانیم! ئەوەتا، بەسەر ئەم شەقامە خامۆش و چۆڵەوە، بێ هیچ جەنتایەک، بێ هیچ بنەوبارگەیەک، بێکەس و تەنیا، وەک ئەو زگورتیە لاوەکیانەی بۆ یەکەمین جار دێنە شارێک و لەو شارەدا هیچ کەس ناناسن. تەنیا چەپکێ گوڵاڵە کێویلەم پێیە، ئەو گوڵاڵە کێویلانەی کە هەمیشە (شادان) دڵێک و هەزار سەودا شەیدایان بوو. دەیگووت:«کە ئەو گوڵاڵە کێویلانە دەبینم، هەمیشە، ڕۆژی گەشتەکەی کۆتەڵم وەبیردێتەوە».
– ئەرێ کەی بوو؟
– ئەو ڕۆژەی بۆ یەکەمین جار یەکترمان ماچ کرد.
– دەزانم! بەڵام چ مانگێک بوو؟
– وابزانم ساڵی «چوارەمی» خوێندنمان بوو لە زانکۆ.



– دەمەوعەسرێکی ڕۆژی هەینی بوو.
هەموو پۆلەکەمان پێکرا، لەگەڵ چەند مامۆستایەکمان، بە گەشتێکی بەهاری، چووینە (کۆتەڵ)، کۆتەڵی پڕ لە کانی و چیمەن و چیا، کۆتەڵی پڕ لەم گوڵاڵەکێویلانە، پڕ لە هەتاو، پڕ لە سەوزەگیا. ئێوارە، دوای سەما و گۆرانی، دووای خواردن و خواردنەوەیەکی خۆش، هەر جووتێک، هەر کوڕ و کچێک بەرەو بن درەختێک ڕۆیشتن. من و شادانیش، بەدەم پیاسەوە لامان دایە سەر جۆبیارێک. کە گەیشتینە قەراغ جۆبیارێک، لەناو سەوزاییەکەدا ئیستێکم کرد و دانوشتامەوە، چەپکێک گوڵاڵە کێویلەم دەسکەنەکرد و بە دڵێکی لەرزۆکەوە بەرەو ڕووی چووم.
لەو دەمەدا (شادان) وەک ئەوەی کە من، ڕۆحم، هەموو بوونم لەناو ئەو چەپکە گوڵاڵەکێویلەیەدا دەسکەنەکردبێ، بە نیگایەکی گەرمی پڕ لە شەرم و سۆزەوە، سەیری ئەو گوڵاڵەکێویلانەی ناو دەستی دەکردم. منیش، لەسەرەخۆ، کەمێک شەرمن، بە دەنگێکی پڕ لە سۆزەوە، پێم وت:
– ئەم گوڵاڵە کێویلانەم بۆ تۆ دەسکەنە کردن، شادان...
هێشتا باوەشم پێدانەکردبوو، پێکەنی، بازووەکانی ئاڵاندە ملم، گوتی:
–«..گیان!»
ئیتر (شادان) لەو ڕۆژەوە، عەشقی «گوڵاڵەکێویلە » لەکەللەی دا. بەیەکەوە چووباینایەتە هەر گەشتێک، هەر پیاسەیەک، بەبێ چنینی چەپکێ «گوڵاڵەکێویلە» نەدەگەڕاینەوە. ئاه! ساڵانێکی زۆرە گوڵاڵەکێویلەمان بەیەکەوە نەچنیوە، ساڵانێکی زۆرە گوڵاڵەکێویلەمان بەیەکەوە بۆن نەکردووە! بەڵام نا، ئەوەتا.. تەنیا چەند ساتێکی دیکەیە و تەواو! ئێستا، هەرکە ئەم گوڵاڵەکێویلانەی دەستم دەبینێ، دەگەشێتەوە، تەنانەت تاڵی و ناخۆشی و دەردەسەریی هەموو ئەو چەند ساڵانەشی بیر دەچێتەوە. دڵنیام، لەوساتەدا، یەکسەر دەکەوێتەوە یادی ئەو ئێوارەیەی، بۆ دووایین جار، لە دووایین ساتەکانی خواحافیزیدا، بەرێی دەکردم: دڵۆپە فرمێسکی درۆشت وروون، لە

چاوەکانیدا قەتیس مابوون، وتی:

– بڕۆ، دڵ لە دڵ مەدە!

وتم: «دەترسم»

وتی: «لە چی؟»

وتم: «لەوەی کە یەکتری نەبینینەوە».

وتی: «دڵنیابە، ساڵێکی ترە، منیش کە خوێندنەکەم تەواو دەکەم.. شاخ ڕێگامە!».

ئەوەتا! ئەمە شەقامەکەی ئیبراهیم پاشایە! ئەو شەقامەی کە هەمیشە جێگای ژوان و پیاسە و پێکەنینمان بوو. سەیرە! زۆر سەیرە: ئەم ناوە هیچی نەگۆڕاوە؟ هەر وەک خۆیەتی! ئالێرەوە کە پێچ دەکەیتەوە، لەم خەستەخانەیەدا شیریان دەبەشیەوە سەر منداڵان، «ئیتر لەمەوە، خەڵک هەر پێی دەڵێن «خەستەخانەی شیرەکە». ئەوەتا ئەمەش چایخانەکەیە. هەموو جارێ لەم چایخانەیەوە تەلەفۆنم بۆ ماڵەوەیان دەکرد. ئەرێ ژمارەی تەلەفۆنەکەیان چەند بوو؟ دوو- یەک- سفر- چوار... بەڵام نا، نەء- تەلەفۆنیان بۆ ناکەم، بۆئەوەی ئەم گەڕانەوە کت و پڕەم، لەناکاو بێ، شتێکی چاوەڕوان نەکراو بێ، ببێتە مایەی شاگەشکەبوونی هەموویان. ئێستا، بێگومان، هەر یەکێکیان کە دێت و دەرگاکەم لێ دەکاتەوە، واقی وڕ دەمێنێ، دەحەپەسێ. خۆ لەوانەشە کە دەمبینن، لە سەرەتادا، هەر نەشمناسنەوە. بەڵام ئیتر ئەوەی خۆشە کە دەچمە ژوورەوە و دەگەمە ناو ساڵۆنەکەیان! ئیتر.. کە خۆش دەبێ! دەبێتە هەرا! یەکێک پێم دەڵێ «لاوازبووی»، ئەوی تر دەڵێ: «نەء، قەڵەوبووە». دڵنیام جارێ هێشتا هەر لەناو حەوشەکەیاندام، یەکە یەکەی برا بچکۆڵەکانی، خوشکەکانی، دایکی، باوکی.. لە دەورم دەئاڵێن و پرسیارم لێ دەکەن. منیش لەو ساتەدا، لە شڵەژان و شاگەشکەبوونی خۆمدا، لەوانەیە زمانم تێک بئاڵێ و نەتوانم هیچ شتێک بڵێم، هەر پێ بکەنم. ئاخر، لە کوێوە دەست پێ بکەم؟ چ بڵێم! لە کورتی دەیبڕێنمەوە، دەڵێم: «شەو و ڕۆژێکە لەژێر پشکنین و تەحقیق و تەحقیقکاریدا بووم، تازە بەڕەڵایان کردم. یەکسەر هاتم بۆ لای ئێوە، لە ئێوە زیاتر هیچ کەس و کارێکی دیکەم



نیە!» ئیتر دایک و باوکی شادان، یەکسەر تێدەگەن، پێویست ناکا قسەی تر بکەم.

هەرچۆنێ بێ، خۆم وانیشان نادەم کە لەدەست ژیانی پێشمەگەیی ئەو چەند ساڵەم، هیلاک و بێزار بوویمە، باسی ئەوەناکەم کە ورەو باوەڕی ژیانی پێشمەرگایەتیم نەماوە! ناڵێم باوەڕم چیتر بەو حزبە سیاسیانە نەماوە و بۆیە تەسلیم بوومەتەوە، نەء، تەنانەت باسی ئەوەشیان لە لا ناکەم کە بەر گازی کیمیاویەکە کەوتووم ولەگەڵ سەدان پێشمەرگەی تر و هەزاران خەڵکی بریندار تر راگوێزراومەتەوە (نەخۆشخانەی تاران) و سێ مانگان بە نەخۆشی و برینداری لە نەخۆشخانەی تاران ماومەتەوە؛ ئنجا دووای ئەوەش چوار مانگی رەبەق، بەپەناهەندەیی، بێ پارە و پوول، بێکەس، بێ ئەنوا، لە ئوردووگای «سمنان» ژیانی کوولەمەرگی و دەردەسەریم بەسەر بردووە. نەء. لەبەردەم دایک و باوک و براکانی، باسی ئەم شتانە ناگێڕمەوە، دەڵێم:

«تەنیا ساچمەیەکی بچووک بوو، لە شەڕەکەی دەشتی بادینان بەر قۆڵنجی چەپم کەوت و تەواو.. ئیتر لەبەر ئەوەبوو.. ئێستاش، چیتر ناتوانم چەک هەڵبگرم، بۆیە گەڕاومەتەوە!».

ئا، هەروا دەڵێم! پێویست ناکا قسەی تر بکەم و درێژەی بدەمێ. تەنانەت ئەگەر پرسیاری ماڵەوەمان و دایک و باوکمیشیان پرسی، ئیتر خۆیان ئاگاداری وەزعی (هەڵەبجە) هەن، دەزانن چ خەبەرە! بە هیچ شێوەیەک باسی ئەوە ناکەم کە ورد و درشتی ماڵەوەمان، گەورە و بچووک، بەر بۆمبی گازە کیمیاویەکە کەوتوون و.. مردوون. نەء. نامەوێ کە ئەم چەند ساتە کورت و خۆشە، پڕ ئاسوودەییە، لەناکاو بشێوێنم و دڵی هەموویان پڕ بکەم لە حەژمەت و ماتەم و نسکۆ. نەء! ئەگەر پرسیاری ماڵەوەم لێ بکەن، دەڵێم: «باشن»، «ئەوەتا وان لە هەمەدان»، «لە ماڵە خزمێکی باوکم».

فرمێسکەکانی چاوم سڕیەوە و پەنجەم لەسەر زەنگی دەرگاکە لابرد. زەنگی دەرگاکە، لەناو حەوشەکەدا دەنگی دایەوە. هێندەی پێ نەچوو، کە گوێم هەڵخست: تەپەتەپێکی هێور و لەسەرەخۆی چەند هەنگاوێکم کەوتە بەر گوێ. بەڵام سەیربوو، لە دەنگی پێی ئینسان نەدەچوو!

نزیکتر دەکەوتەوە. گەیشتە پشت دەرگاکە.

کە سەرنجم دا، دیتم دەرگاکە هەر لەخۆیەوە، یەک درز کرابۆوە. لەناکاو، جیڕەیەکی بەئاستەم و کورتی لێوە هەڵسا. دەرگاکە، وردە وردە، زیاتر، زیاتر دەکرایەوە. کەچی هیچ کەسێکیشی لێوە دەرنەدەکەوت. ترسام.

کە چاوم داگرتەخوارەوە: پشیلەیەک، تەنیا سەروملی هێنابووە دەرەوە. چاوێکی بەتەواوەتی کوێر بوو، چاوەکەی تریشی، تۆپەڵێ جیق و کێمی خوێناویی پێوە هاتبووە خوارەوە. سڵەمامەوە. ترسام. بەدەستی راستم، دەرگاکەم بەلای ژوورەوەدا پاڵ خست و یەکسەر بەسەر پێپیلکانەکەدا سەرکەوتم. بێ ئەوەی لەدەست خۆم بێ، بەپرتاو، خۆم کردە ژورەوە. لەناو حەوشەکەدا، دیتم: پیرەژنێک، کاژەڵاک سپی، دەست بە گۆچانێکی خوارەوە، بەرەو رووم دەهات.

پیرەژنەکە، سەرتاپای جلوبەرگی: رەشپۆش، پەڵەی پیسی رشانەوە و شۆربا بەسەر دامێنیەوە بوو.

من کە سەیری ئادگار و دەم و لێوی ئەو پیرەژنەم دەکرد، هەستم دەکرد ئەو پیرەژنەم چەند ساڵێک پێش ئێستا، لە شوێنێکی دیکەدا، یا «لە خەونێکم دا» دیوە، بەڵام من، لەتاو شڵەژان و هەترەشچوونی خۆمدا، بیرم شێوا: نەمدەتوانی وەبیرخۆمی بهێنمەوە.

پیرەژنەکە، لە ناوەڕاستی حەوشەکەدا، لەناکاو، راوەستا. یەکسەر گۆچانە خوارەکەی بەرەو سنگم بەرزکردەوە، بە دەنگێکی وەک دەنگی کوندەپەپوو، شتێکی وت، تێی نەگەیشتم؛ بەڵام سەرتاپای رۆحم، لەگەڵی داچڵەکی. ترسام. کشامەوە.

لەناو حەوشەکەدا، سەرم سوڕ مابوو! پاشان پیرەژنەکە، دیسانەوە، بە هەمان شێوە، بەڵام ئەمجارەیان زۆر توند و تووڕەتر، هەمان شتی دووبارە کردەوە. یەکسەر تێگەیشتم: «لاڵە».

لەناو دەرگاکە راوەستابووم، بەحەپەساویەوە سەیری ژوورەوەم دەکرد: ناو چیمەنەکە، جۆڵانەیەکی لاخواری لێ بوو، بە زنجیرێکی ژەنگاویی درێژ شۆڕببوۆوە، ئارام ئارام جیڕەی دەهات و دەهەژایەوە، جیڕەیەکی تەنیا کەساس و غەمگینی لێوە دەهات. لەو بەریشەوە، مەنجەڵێکی



گەورەی رەشی کوڵاندنی دانوولە، لیقاوێکی سپیی پیسی پێد رژابوو، قەڵب کرابۆوە، مێش و مەگەز تێی وەرهاتبوون.

مێشکم خەریک بوو شەقی دەبرد. دەمویست هەر چۆنی بێ، سۆراغی (شادان) لەو پیرەژنە بپرسم . بەڵام لەوکاتەدا، نازانم چ شتێک بوو وای لێدەکردم لەبەرامبەر ئەو پیرەژنەدا، هەست بە شەرمەزارییەکی زۆر بکەم، لەوەی تەنانەت هەر ناوی شادانیش بێنم. ناچار ئیشارەتێکم بۆی کرد کە دەمەوێ هەواڵی «باوکی شادان» بپرسم. لە وەڵامدا، لە هەمان شوێنی خۆیەوە، بڵمەبڵم و غەڵبەغەڵبێکی دیکەی کرد و یەک دوو جاران گۆچانە خوارەکەی بەرەو «ئاسمان» راوەشاند. دەیویست تێم بگەیەنێ و دەمویست تێی بگەم؛ نەماندەتوانی. دەمویست تێی بگەیەنم و دەیویست تێم بگات؛ نەماندەتوانی. هەرچەندی دەمکرد و دەمکرد: دەنگم لە قوڕگم دەرنەدەهات کە پێی بڵێم: «شادان!»، « کوا شادان ؟».

لەناکاو، دیسانەوە، گۆچانە خوارەکەی لە رووم بەرزکردەوە. وەک خووگرتوویەک، دەمی کەفی کرد: بە ئازار و زەحمەتەوە هەوڵی دەدا شتێک بڵێ؛ تێی نەدەگەیشتم. ئنجا پاشان وەک ئەوەی بگری، وتی:

- ڕڕڕراغ...! ڕڕراغ!!

من حەپەسابووم، سەیریم دەکرد. ئەویش تابڵێیی گرژ و توند و تووڕە؛ گۆچانە خوارەکەی، دیسان، بە ئیشارەتی ئەوەی دەرم بکا و هەڕەشەم لێ بکا، رووەو سنگم راوەشاند، قیڕاندی:

-ڕڕ ڕڕراغ...!

- ڕڕڕراغ!

لەترسان، خەریک بوو شێت دەبووم. لەناو دەرگاکەوە، پشتاوپشت، کشامەوە. پێم تێک ئالا، کەوتمە سەر سەکۆی بەر دەرگاکە. بەحەپەساوی و زەبوونییەوە، تەماشام دەکرد. گۆچانە خوارەکەی، بۆ دووایین جار، بەسەر سەرمدا بەرزکردەوە، وەک دەرم بکات و تانەیەکم لێ بدا؛ قیژاندی:

-ڕڕڕراغ!!.

دەرگاکەی لە ڕووم داخستەوە. لەپشت دەرگا ساردەکەوە، دەرکراو،

دڵم خەریک بوو شەقی دەبرد. نەمدەتوانی بگریم. بە دڵێکی پڕ لە حەژمەت، بە ویژدانێکی بریندارەوە، گوڵەکێویلەکانم لەسەر سەکۆی «بەردەرگاکە» دانا؛ بێ ئەوەی بتوانم سەیری هیچ شتێک بکەم، پاشەوپاش، کشامەوە...

**پاریس ١٩٨٨**



# ژنێک

بارەکە زۆر تەنگ و نووتەک و تاریک بوو. بنمیچەکەی، وەک بنمیچی تارماویی ئەشکەوتێکی کۆن، کە شەوێ لە شەوان لە خەون دیبووم، ڕەش هەڵگەڕابوو. دیوارە به تاق و دەلاقە نەخشێنراوەکانی، ڕزیو، پڕ درزی گەورە، هەمیشە بۆنێکی ناخۆش لە پاشماوەی ڕشانەوە و بەڵغەم و خواردەمەنیە بۆگەنبووەکانی پەنا دیوارە بە چڵک بۆرەکان دەهات. ڕۆشناییێکی مەیلەو شین، کزکز، لە گڵۆپە چووکەڵە هەڵواسراوەکانەوە، دەپرژایە سەر مێز و کورسی و دەموچاوە بە خەم ماندووەکان.

ڕۆشناییەکە، لەتوێی دووکەڵە جگەرەکانەوە، نەیدەتوانی بەتەواوەتی تاریکییەکە ببڕێ و ئەم ناوە تەواو ڕووناک بکاتەوە؛ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، دەموچاوەکان، بەڕوونی دیاربوون. کە لێیان ورد دەبوومەوە: دەم و چاوی کرێکار، شوفێر، قوتابی، سەرسەری، ئەفەندییە تەقاویتەکان؛ پاشماوەی غەم و تۆز و شەکەتییەکی زۆری ئەو ڕۆژەیان هێشتا بە سیماوە هەر مابوو. چاوانیشیان، چاوانی ڕوون و بریسکەداریان، هەمیشە قەهر و بێزاریەکی هێندە جوانیان تێدا دەدرەوشایەوە کە هەرگیز تاریکییەکە نەیدەتوانی بیشارێتەوە! سەیر بوو.. ئەم خەفەت و خەمناکییە بێ سەروشوێنە، چی بوو، کە هەمیشە دایدەگرتن؟ هەر لەوساوەی کە دەهاتن دادەنیشتن، وەک گوڵ پێش ئەوەی زریانێ هەڵ کا، پەژموردە و سیس، گەڵاکانی خۆی هەڵبوەرێنێ؛ ئەوانیشی واهی. وەک ئەوەی پێشتر بە ماتەم و پرسەیەکی نوێیان زانیبێ، هەمیشە، کە دەهاتن دادەنیشتن، حەسرەت و قەهر و غەمگینیەکی زۆر لەسەر ڕوویان کۆببۆوە. جار جاریش، لەناکاو، کاتی ڕۆشتنان، کاتێ یەکێک دەگەیشتە تینی، پەرداخێکی، بەحەسرەتەوە، بەسەر خۆی دەشکاند. گەلێک ئێواران شەڕ و ئاژاوەی زۆر پڕ ژاوەشی تێدا ڕوودەدا.

من، ئەگەر برادەرانی شارەکەی خۆم لێرە بوونایە، لەوانەبوو بیانگوتایە کە ئەم بارە پیس و پڕ ژاوەیە قەت شیاوی ئەوە نیە «مووچەخۆرێکی وەک من» گشت ئێوارەیەک ڕووی تێ بکا و تێیدا دانیشێ؛ بەڵام من، خۆشم نازانم بۆچی، لەوەتەی غەریب کەوتبووم و هاتبوومەتە ئەم شارە؛ هەر لەم بارەدا ئۆقرەم گرتبوو، دڵم تەنیا بەم بارە



دەکرایەوە. تەنانەت ئێستەش، سەیرە، ئەمە لەوانەیە خۆشەویستی و هاوڕێیەتیی برادەرە خەمخوارەکەم بێ، کە تائێستەش هەر پەلکێشی ئەوێم دەکا. تەواو وەک عاشقێکی بە کۆنە جێژووان پەرۆشی لێکردووم.

من ئەم ئێوارەیەش، تەبای جاران، بە هەمان مگێز و تاسەی جارانمەوە، خۆم خزاندە بارەکەوە و چووم لەسەر کورسییەک دانیشتم. بەهەمان ئەو بێدەنگییەی کە پێی ڕاهاتبووم، بەبێدەنگیی هەر مووچەخۆرێکی زگورتی و غەریب لە شارێکی قەرەباڵغدا، کەوتمە ورد بوونەوە و سەرنجدان لە دانیشتووانی سەرکورسی و ئەودیو مێزەکان. بەڵام داخ، دیسانەوە، کەسێ نەبوو ئەو هاوڕێیەی جاران ئاسا، دەستی بەخێرهاتنم بۆ هەڵببڕێ و شەرمی نامۆییم پێ بشکێنێ؛ کەسێ نەبوو جگەرەیەکم پێشکەش بکات، تەواو وەک ئەو، هەستی تەنیایی و بێ هاوەڵیم کپ بکاتەوە. نەبوو. من لەو بارەدا تاقە کەسێک بووم کە هەست بە زگاری و بێ هاوەڵی و نامۆیی بکەم. بەڵام چاوم هەر دەگێڕا. چاوم، ورد ورد، بە دەموچاوەکاندا، بەدووای ئەم هاوڕێ خەمخوارەدا دەگێڕا؛ بەڵکو ئەمە خوایە هاکا چاوم پێی بکەوێتەوە و بێت لەلامدا نەختێ دانیشێ: باری زگاری و غەم و غەریبیم نەختێ سووکترکا!

من ئەم ئێوارەیە کاتێک چووم و دانیشتم، هەرکە دانیشتم و دانەنیشتم، چاوم بە کابرایەک کەوت: گەنجێکی نەختێک بەنێو ساڵ کەوتووی، پاڵتۆ بەپینە و بەچڵک بۆر بوو. لەوە دەچوو پاشماوەی ئەشکەنجەیەکی زۆر، یان ئازار و ئەزیەتێکی رۆحی، هێشتا لە گیانی هەر مابێتەوە. لە دوورەوە، تەنها و مەلوول، ئانیشکی بەسەر مێزێک دادابوو. برینێکی درێوی قەبەیش، کە زێتر لە پاشماوەی شوێن سووتانێک دەچوو، بە لاچەناگەیەوە، تا ملی، داکشابوو. ئەو برینە، یەکسەڵەف، برینی سەرپشتی پیاوێکی دیکەی بیرهێنامەوە، کە نۆزدەساڵ پێش ئێستە بە منداڵی لە گوندەکەماندا دیبووم؛ دەیانگوت: داڵ ئەو شەبەقە برینەی لەسەر پشتی هەڵڕنیوە!

من لەسەرەتادا دوودڵ بووم لەوەی کە ئەمە هاوڕێ خەمخوارەکەی خۆم بێ، بەڵام کە چێتر لە ڕەنگ و ڕوخساری ورد بوومەوە،

بەتەواوەتی ئەرخاین بووم کە ڕاستە ئەم کابرایە هەمان ئەو هاوڕێ خەمخوارەی خۆمە کە جاران، بەو هەموو ڕێکپۆشی و ویقارەی خۆیەوە، لێرە دەمدی. ڕاستییەکەیشی، هاوڕێکەم زۆر گۆڕابوو: بڕست لێبڕاو، پەرپووت، زۆریش ماندوو. سەروقژی، کە جاران بە نیانییەوە تەوالێت دەکران، ئێستە: تێکچرژاو، بێ خزمەت و بژ بوون. بەپێچەوانەی پاکی و تەمیزییەکەی جارانیشیەوە، بۆن ڕشانەوەیەکی ناخۆشی لێدەهات. پاشماوەی شلەی بامیە بە ریش و یەخەیەوە دیار بوو. چەند مێشێک تێی وەرهاتبوون، بەسەر سەریەوە گیزەگیزیان بوو. هاوڕێکەم، پێش ئەوەی کە بێت بۆ ئێرە، دیار بوو لە بارێکی دیکەدا زۆری خواردبۆوە. تەواو سەرخۆش ببوو. لەسەر مێزەکەی خۆیدا بەلادا دەهات. تەنانەت توانای دەرکردنی مێشەکانی دەوری خۆیشی نەمابوو.

کەی بوو؟ کەی بوو بۆ دووا جار ئەم هاوڕێیەی خۆمم لێرە بینی؟ بەڵێ، ئێوارەیەکی سارد و بە غوبار زەرد بوو. ئەو ئێوارەیە، تازە یەکەم پەڵە هەوری تەڵخی زستان بە ئاسماندا ڕادەبورد: بەتەپ و تۆز، هەر وەک ساڵانێکی زۆر بێ داینەکردبێ، دایکرد. منیش لە ژوورەوەڕا، لەودیو پەنجەرەی بە شەونم لێڵی بارەکەوە، سەرنجم بڕیبووە سەر شەقامەکە: پێنج شەش کامیۆن و زیلی سەربازی، بەسەر جادەکەوە، لەدووای یەکتر، ڕەت دەبوون ولەژێر بارانەکەدا هێور هێور دەشۆران. ڕێبوارانی بەربارانەکەش، هەبوو بە چەتر، هەشبوو بێ چەتر، هەبوو بەتەنیا، هەشبوو جووتەنی.. بەپەلە، لەسەر شەقام و شۆستەکانەوە، بۆ خۆداڵدەدان ڕایاندەکرد. لە دڵی خۆمدا دەمگوت: «وەختی بارانان، ڕێبوارانی پەست و خەمناک زۆرتر دەخزێنە مەیخانانەوە». هێندەی پێ نەچوو، دووای ئەوەی کە یەک دوو ڕێبوار وەژووری کەوتن؛ هاوڕێکەم وەدیارکەوت، بە هەمان ئەو هەنگاونانە لەسەرخۆ و پڕ هەیبەتەی، کە تەواوی مانای شکۆداری و مێرخاسیی دەبەخشی، بە هەمان ئەو سیما گەش و پڕ خەمخواری و دڵسۆزییەی، کە هەمیشە لەسەر دەموچاویدا دەردەکەوت؛ هات لەسەر کورسیەکدا، بە دەوری مێزی هاوڕێیانی خۆیدا دانیشت. هاوڕێکانیشی، بە هەمان ئەو لەبەر هەڵسانەوە و ڕێزگرتنە پڕ مانایەی، کە هەمیشە لەڕاست ئەودا پێی ڕاهاتبوون، بەخێر هاتنیان کرد و جگەرەیان بۆ ڕاگرت. ئنجا چارەگێک عەرەقیشیان بۆی



بانگ کرد و کەوتنە قسە و باسی خۆیان.

ئەفسوس! ئیتر کابرا لەو ڕۆژەوە چیدی ڕووی نەکردەوە ئەو بارە. من لە هەموو ئەم شارەدا دڵم تەنها بەم هاوڕێیەم خۆش بوو، کە لەم دواییەدا جار جار لای دەکردەوە سەر مێزەکەی من و بۆ یەکتر دەدووایین. ڕاستییەکەیشی، من تەنیا لەم ماوەیەی بێ ئەویدا هەستم بەو زگارییەی خۆم کرد کە ئێواران لەم شارە غەریبەدا چەند هەست بە تەنیایی و سوگواری و خەم دەکەم! بەس لەم ماوەیەشدا لەوە تێگەیشتم کە ئەم شارە چەندە چۆڵە و چەندە زیز و چەندیش خەمناک! بەڵام من بەم هەستی تەنیایی و بێ هاوەڵیەشەوە، بەدرێژایی ئەو هەموو مانگە، هەر لە چاوەکووڕەیدا بووم. گشت ئێوارەیەک، وەک چاوەڕێی ئازیزترین کەسی عومرم بکەم، دەچووم بەنیگەرانی و تاسەیەکی زۆرەوە، لەپشت مێزێک دادەنیشتم؛ چاوم دەبڕیە دەرگای بارەکە.

ئەم ئێوارەیە، کاتێ ئەو هاوڕێ شکۆمەند و ڕێکپۆش و سەرازایەی جارانم، ئاوها زەبوون و گۆشەگیر و تێکشکاو بینی؛ باوەڕم بە چاوی خۆم نەکرد. سەیربوو: مەیخانەکە هەمان مەیخانەکەی جاران بوو، هاوڕێکانی هەمان هاوڕێکانی جاران بوون؛ بۆچی ئەم جارە وا بە مەلوولی و سەرکزییەوە دانیشتبوو؟ بۆچ هاوڕێکانی، وەک ئەوەی بێزی لێ بکەنەوە، دوورە پەرێز: خۆیان لەناو هەمان لاقرتێی جارانیاندا، بەو نیگا بێزەوەر و کەمییەشەوە دەیانڕاوانیە ئەم؟ بۆچی؟ سەیربوو! چاوەکانی ئەم کەڵەمێردە، کە جاران گەش و پاک و ڕوون بوون، ئێستا: خەمناک، بە قووڵدا چووبوون؛ هەرگیز لەو چاوانەیان نەدەکرد کە جاران سەر بڵندی و بەختەوەرییان تێدا دەدرەوشایەوە. ئێستا زیاتر لە چاوانی مرۆڤێکی ریسوا و ئەتک پێکراو دەچوون.

ئاخ! من وابزانم ئیتر لەم ئێوارەیە بەملاوە ببڕای ببڕ ناتوانم چیتر ڕووبکەمەوە ئەم بارە. لە هەر یاگە و شوێنێکیش ئەم هاوڕێ چاک و خەمخوارەی خۆم ببینمەوە، فیگاریەکی قووڵ دامدەگرێ و دڵیشم شەق دەبا.

**١٩٨٢**

## کتێبەکانی تری نووسەر:

١- ماڵئاوا ئەی وڵاتەکەم، شانۆنامەی یەک پەردەیی، بڵاوکراوەکانی یەکیەتیی نووسەرانی کوردستان ( شاخ)، ژمارە ( ١٨): ١٩٨٤
٢- بەیانیت باش ئەی غەریبی، شانۆنامەی یەک پەردەیی، بڵاوکراوەکانی بنکەی یەکگرتن، کۆپنهاگن: ١٩٨٨.
٣- Exil شیعر، بڵاوکراوەکانی ئەنستیتووی کورد لە پاریس، ١٩٩٤.
٤- گۆڤاری کوردستان، ئەستەمبوڵ ( ١٩١٧ - ١٩١٨)، ژمارە ئەسڵییەکان و تۆژینەوەیەک، بڵاوکراوەکانی دەزگای گوڵان، هەولێر: ١٩٩٨.
٥- رۆژنامەگەریی کوردی بە زمانی فەرەنسی، بڵاوکراوەکانی گۆڤاری سەنتەری برایەتی ( ژمارە ١)، هەولێر: ١٩٩٨.
٦- سەرچاوەکانی کوردناسی Kurdiligie، تۆژینەوە، بڵاوکراوەکانی بنکەی رووناکبیریی گەلاوێژ، سلێمانی: ١٩٩٨.
٧- وێنەی کورد لە ئەرشیفی کوردناسە ئەورووپاییەکاندا، بڵاوکراوەکانی وێران، هەولێر: ١٩٩٩.
٨- مانیفێستی دووەمی وێران، سپییاییەکانی ناو رەش رەشاییەکانی ناو سپی، کۆمەڵە شیعر، هەولێر: ١٩٩٩.
٩- زێڕی ناو زبڵ، وەرگێڕانی نووسراوی رۆژهەڵاتناسەکان لەبارەی کورد، لە فەرەنسییەوە، بڵاوکراوەکانی دەزگای سەردەم، سلێمانی: ١٩٩٩.
١٠- ئینجیل لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا ( ١٨٥٧ - ١٩٥٧) سەرەتاکانی سەرهەڵدانی پەخشانی کوردی، م. ب. ئاشتی، دهۆک: ١٩٩٩.
١١- ئینجیل د مێژوویا ئەدەبیاتێن کوردیدا، دەسپێکێت سەرهلّدانا پەخشانا کوردی، بنگەهێ ئاشتی بو بەلاڤکرنێ، دهۆک: ١٩٩٩.
١٢- دراسات فی تاریخ الکورد، ترجمە ترزە فائق الجاف، منشورات رابطە کاوا، بیروت: ١٩٩٩.
١٣- جوایەز، بەرهەمی نۆ شاعیری هەولێری ( کۆمەڵە شیعری هاوبەش)، دەزگای ئاراس، هەولێر: ١٩٩٩.